

## مجلة المجمع العلمي الكردستاني

## العدد: ٦

كردستان – اربيل
٢٠٠٧

# ACADEMY

*a Periodical Published by Kurdistan Aacademy*

Vol .6

Kurdistan – Hawler (Arbil)
2007

## ناوەرۆك

# پێشەکی

ژمارەی پێشووی کۆواری کۆڕ لەناو ناوەندی ڕۆشنبیریی کوردستاندا بەباشی دەنگی دایەوە، بەتایبەتی سەروتاری کۆوار کە تیشکی خستبووە سەر بارودۆخی ساڵانی رابردووی تەمەنی کۆڕ و ئاڵۆزییەکانی پرسی هەڵوەشاندنەوەی. لە ڕاستیدا، ئەوە جاری یەکەم بوو، کە ئەندامانی کۆڕ لەبارەی ناگزووریی خۆیان و دامەزراوەکەیانەوە، ئەوەی لە بیریاندا دەسووڕایەوە بیخەنە سەر ڕووپەڕی نووسین و لە داروباری خۆیان بە دەنگ بێن، ئەگینا لە ساڵانی پێشوودا بێدەنگی و دان بەخۆداگرییان پێ چاتر بوو لەوەی کاتی خۆیان بەئاخاوتن و قەرەباڵغی پڕ بکەنەوە. لە ئەنجامی ئەم بێ دەنگییەدا، زۆربەی خەڵك ئاگاداری راستییەکان نەبوون و وایان دەزانی کۆڕ دەزگایەکی نەکارە و بێ بەرهەمە. بەڵام بۆ ئێمە مایەی خۆشحاڵی بوو کە دواجار دەرفەت رەخسا تا راستییەکان بدرکێنین. ئەوەبوو ژمارەیەکی زۆر لە خوێنەران و ڕۆشنبیران، پاش ئەوەی ئەم راستییانەیان زانی و بۆیان دەرکەوت کەمایەسی لە کوێدایە، لەگەڵ کۆڕدا هاوسۆز بوون.

ئێمە پێمان وایە کۆڕ لە ماوەی ساڵانی پێشوودا کەمتەرخەمییەکی نەبووە تا گلەییی زۆری بێتە سەر، یان بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێت و بێ هەبوونی بیانووی بەجێ، دەست لەکارکێشانەوەی بەکۆمەڵ بەئەندامەکانی ئیمزا بکرێ. ئەگەر یەکگرتنەوەی ئیدارەکان بیانوو بوو بۆ ئەمە، ئەوا ئێمە پێشنیازی بابەتیمان بۆ دەرچوون لە کێشەکە خستبووە

روو، وەك ئەوەی ئەنجومەنی كۆڕ فرەوانتر بكرێ، یاخۆ چەند ئەندامێك لە ئەنجومەنی پێشوو بەخۆهێشتی خۆیان دەست لەكار بكێشنەوە و رێ چۆڵ بكەن بۆ ئەوانەی تازە دێن. بەداخەوە ئەمانە هیچیان نەكران و كەس گوێی لێ نەگرت.

لە ماوەی ساڵانی رابردوودا، باری دارایی كۆڕ ناڵەباربوو، نەبودجەی هەبوو نەمووچە و نەخەرجیی رێكوپێك. لە هەمان كاتدا كەس بەدەنگ داخوازەكانی كۆڕەوە نەهات، هیچ دەزگایەكی رۆشنبیری گوێی لە رێنوێنی، یان داوایەكی كۆڕ نەگرت. رۆشنبیران و لێكۆڵەوان لێی لالووت بوون بێ ئەوەی بیانووێك لە ئارادا هەبێ. تەنانەت ئەو وەزارەت و دەزگا رەسمییانەش كە هەندێك لە كارەكانیان لەگەڵ بڕبڕەی ئەركەكانی كۆڕدا تێكی دەكردەوە، بەجۆرێك كاریان دەكرد و بڕیاریان دا، وەك ئەوەی كۆڕ هەر نەشبێ. هەموو ئەمانە رۆڵیان لە پەراوێزخستنی كۆڕدا بینی، هەرچەندە ئێمە هیچ رۆژێك ئەم باسانەمان نەخستەڕوو و پەنامان بۆ بانگەشەی راگەیاندن برد. پێمان وابوو رۆژێك دێت ئاو دەچێتەوە ئاوەڕۆ و كەموكورتییەكان پڕدەكرێنەوە، بەڵام ئەوەی بینرا برێتی بوو لە هەڵتەكاندن و لەناوبردنی ئەوەی كە هەشە.

هەرچۆن بێ، ئەوا ئەمرۆ چەند مانگ بەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی كۆڕدا تێپەڕی، بەگوێرەی نەریتی باو ئێمە لە هەڵسووڕاندنی كاروباردا بەردەوام دەبین تا دەستەی تازە، كار دەگرێتە دەست. باوەڕیشمان وایە ئەو دەستە تازەیە لە دایك نابێ، لەبەرئەوەی لە سەرەتاوە كار بۆ ئەوە نەبووە هەلومەرجی كاركردنی كۆڕ باشتر بكرێ. ئێمە تەواوی بڕوامان هەیە كۆڕی زانیاری كوردستان لەوە باشتر نابێ كە هەبوو. ئەوانەی دەستیشیان

لە هەڵوەشاندنەوەیدا هەبوو، دەماری خێڵەکییانە و تۆڵەسەندنەوە لە پرسی هەڵبژاردنی دەستەی سەرۆکایەتیی پێشوودا هانی دابوون، نەك دڵسۆزی.

نموونەیەك بۆ بەڵگەی راستیی قسەکانمان بۆ ئەوەی کۆڕێکی تر لەمە باشتر پەیدا نابێ ئەوەیە کە ئێستە دەبینرێ. لە ماوەی ئەم چەند مانگەی دواییدا دوو ژمارە لە کۆواری کۆڕ دەرچوون. لە ئەنجامی ئەوەیش کە کەس بابەت بۆ کۆواری کۆڕ نانێرێ و هیچ زانکۆیەك هانی مامۆستایانی نادات لە کۆواری کۆڕدا بنووسن، ئەمە چەندەمین ژمارەیە ئەندامانی کۆڕ خۆیان کۆوارەکە پڕ دەکەنەوە و سەریش کەوتوون و توانیویشیانە لە ئاستێکی بەرزدا رای بگرن. راستت دەوێ ئەم وڵاتە لەم ماوەیەدا بە ماوەی قاتوقڕیی تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی زانستیدا رادەبوورێ، بۆیە ئەوەی دەبینرێ هەر ئەوەیە کە هەیە. کەس لە ئێمە زیاتری پێ نەکراوە و کەسیش زیاتری پێ ناکرێ.

جگە لە کۆواری کۆڕ، زیاتر لە ٢٤ کتێبی دانسقە و باش لە بەرهەمی ئەندامانی کۆڕ و هاوکارانی، رێگەی چاپیان گرتووەتەبەر و نیوەشیان لە چاپخانە دەرچوونە. ئەمانە بەشێکن لە کار و کردەوەکانی ساڵانی رابردوومان، کە بەهۆی ناپوختیی باری داراییەوە نەمانتوانیبوو بیانخەینە بەردەستی خوێنەران. هەروەها لێژنە زانستییەکانی کۆڕ بەردەوامن لە کارەکانی خۆیان و لە داهاتوودا بەرهەمەکانی ئەوانیش دەکەونە ڕوو.

لە کۆتاییدا دەڵێین: بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی کۆڕ لەڕووی یاسایی و زانستییەوە بڕیارێکی چەوت بوو. ئەم بڕیارە لە زیان بۆ هەموو لایەك، زیاتر شتێکی تری لێ دروست نابێت. بۆیە وای بە باش دەزانین تا کات ماوە، لایەنگەلی بەرپرس چاوێکی پێدا بگێڕنەوە و بتوانن یارمەتیی کۆڕ بدەن بۆ

ئەوەی باشتر کارەکانی خۆی هەڵسووڕێنێ. یان ئەگەر هەر سوورن لەسەر گۆڕینی ئەنجوومەنی کۆڕ، با ئەو گۆڕینە بەڕێککەوتن و هاوئاهەنگی لەگەڵ ئێمەدا و بەرپرس و ڕاوێژی ئێمە بێت. ئەوا شەش ساڵ زیاترە ئێمە لەم دامەزراوەیەدا کار دەکەین و پێمان وا نییە کەس لە ئێمە شارەزاتر و ئاگەدارتر بەحاڵ و باری کۆڕ هەبێت.

**دەستەی نووسەران**

# سەرەتای پەیدابوونی ئەدەبی درامیی کوردی و لێکۆڵینەوە لەسەر درامای (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار)

حەمەکەریم هەورامی

(زەکی ئەحمەد هەناری ١٩٠٠ ـ ١٩٦٧) شاعیرێکی کورد پەروەر و دراما نووسێکی لێهاتوو بووە، لە شاری کۆیە لەدایك بووە، لە بواری پەروەردەشدا پەروەردیارێکی دڵسۆزی نەوەی نەتەوەکەی بووە و لەو بوارەشدا چەندین سروود و هۆنراوەی بۆ منداڵانی کورد داناون...[1].

ئەو بەرهەمانەی کە دەچنە خانەی ئەدەبی شانۆگەرییەوە، ئەم دوو بەرهەمەی خوارەوەی لە چاپدراون و دیارن، گوایا هەر لەو بابەتەدا بەرهەمی لە چاپ نەدراوی تری هەن.

ئەمە ئەم دوو بەرهەمەن کە بۆ شانۆی نووسیون و پێیان دەوترێ ئەدەبی درامی یان ئەدەب و هونەری شانۆگەری:

١ـ (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار) کە لە ساڵی (١٩٥٨)دا نووسیویەتی و لە ساڵی (١٩٦٠) لەسەر ئەرکی (نەقابەی مامۆستایانی هەولێر) لە چاپدراوە "قەبارە ناوەندییە و (١١٢) لاپەڕەیە".

٢ـ (لەپێناوی ئەویندا) لە داستانی (محەمەد و سێوە)وە وەرگیراوە و وەکو ئەدەبی شانۆگەری مامەڵەی لە تەکدا کردووە و کردوویەتی بە پێنج

[1] بڕوانە: حەمەکەریم هەورامی، ئەدەبی منداڵانی کورد، کۆڕی زانیاری کوردستان، ٢٠٠٥، ل٢٦٣.

بەشەوە هەر بەشەی لە چەندین پەردەدایە، لە ساڵی (١٩٧٤) لە چاپدراوە و قەبارە ناوەندییە..

لێرەدا ئێمە مەبەستمانە تەنیا لە (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار) بکۆڵینەوە..

بابەتی (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار) لە داستانەکەی زوحاکی زۆردار یان بابڵێین: لە داستانی (کاوەی ئاسنگەر)ەوە وەرگیراوە، کە داستانێکی کۆنی کوردییە و لە کتێبەکەی (شانامەی فیردەوسی ٩٣٢ ـ ١٠٢٠)دا نووسراوەتەوە..

زەکی هەناری ئەو داستانەی بە هۆنراوە کردووە بە شانۆگەری و لە وەختی خۆیدا پێشکەش بە شۆڕشی چواردەی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨) کردووە، بەو بۆنەوە شۆڕشەکەی کاوەی ئاسنگەری هێناوەتەوە یاد کە چۆن نەتەوەی کورد لە بەرەبەیانی مێژوودا شۆڕشی لەو چەشنەی. دژ بە ستەمکاران کردووە..

لێرەدا دێتە پێشەوە کە ئایا (زەکی هەناری) تا چ رادەیەك توانیویەتی ئەو داستانە کۆنە بخاتە ناو قاڵبی هونەری شانۆگەری نوێوە و تازەگەری بەپێی پێویست تیا بکات؟.

## داستانەکەی (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار)

دەئاکی کوڕی مەرداس لەجیاتی (ئەردەشێر) بووەتە پاشای کوردان. ئەو دەئاکە کەسانێکی نەگریس و چەتوونە، لە خۆی بەو لاوە کەسی تری خۆش ناویّ، بە منداڵی باوکی خۆی کوشتووە و جێی ئەوی گرتووەتەوە، هەر خەریکی تەسەلکردنی ئارەزووە چڵێس و پڕ لە ئاڵۆشەکانیەتی، خاوەن کۆشك و قەڵای سەختە، لە خۆی باییە و خەڵکانێکی مشەخۆر و گەندەڵ و چاوچنۆکی

وەکو خۆی لە دەور کۆبوونەتەوە، رۆژێکیان (ئاشپەزەکەی) ماچی هەر دوو سەر شانی دەکات، لە شوێن ئەو ماچانە دوو دومەڵ دەردەچن و دەبن بە دوو ماری برسی و رەگی خۆیان لەناو هەموو لاشەیدا دادەکوتن، تووشی ئالۆشێکی وای دەکەن ئارامی لێ دەبڕن، داو و دەرمانی هیچ پزیشکێك دادی نادا و چارەسەری ئەو دوو مارانەیان پێ ناکرێ.. پزیشکێکی گەڕۆك پەیدا دەبێ و سەیری مارەکان دەکات و بۆی دەردەکەوێت هیچ چارەیەك نییە بەوە نەبێ: بەیانیان و نیوەڕوان و ئێواران مێشکی سەری مرۆیان بدرێتێ، دەنا بە هیچ دەرمانێك دانامرکێن.. ئیدی دەئاك دەکەوێتە ویزەی خەڵك و رۆژی دوو گەنج بۆ ساتۆر بوونی مارەکانی سەر شانی سەر دەبڕدرێن و مۆخەکانی سەریان دەرخواردی مارەکان دەدرێ..

(کاوەی ئاسنگەر)، مۆخی شانزە کوڕی دەرخواردی ئەو مارانە دراوە.. کە کوڕی حەڤدەمی دەبەن، جامی قینی تۆڵە سەندنەوە لێی دەڕژا، پەلامار دەباتە سەر دەئاك و حەڤدەهەمین کوڕی کە برابوو بۆ سەربڕین لێی دەسێنێتەوە، وەلێ کاوە وازی لێ ناهێنێ و کۆمەڵە گەنجێك لە خۆی کۆدەکاتەوە و لە دژی شۆڕشێك بەرپا دەکەن، پەلاماری دەدەن و قەڵاکەی دەڕووخێنن و کاوە بە چەکوشەکەی دەستی سەری دەئاك پان دەکاتەوە..

پاش سەرکەوتن بەسەر دەئاکدا پێشنیار دەکرێ کاوە ببێ بە سەرکۆمار "کەچی ئەو فەریدون ناوێك بۆ ئەو کارە هەڵدەبژێرێ و ئەویش پایەی سەرکۆماری وەردەگرێ و ستایشی هەمووان دەکات".

ئەمە پوختەی ئەو داستانە بوو کە لە دراماکەی (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار)ی مامۆستا (زەکی هەناری)یەوە هەڵدەهێنجرێ، دراماکە کە لەو

داستانە دروست بووە بە هۆنراوەیە و لە هەشت بەشدایە و هەر بەشەی لە چەندین پەردەدایە، نووسەر ئەو هەشت بەشەی بە داستان ناوبردووە..

## کەسانی ناو دراماکە

سەرجەمی ئەو کەسانە کە لەناو رووداوەکانی دراماکەدا دەبینرێن، بەپێی ئەو لیستەی کە نووسەر خۆی لە سەرەتای کارە هونەرییەکەیدا بۆی کردوون، جگە لە هەردوو پاڵەوانە سەرەکییەکە (کاوە و دەئاك) (٢٥) کەسن کەچی لە راستیدا لەو ژمارەیە زیاترن و چەندین کەسانی ترن وەکو: (فەریدوون، پیێ تۆڵ، دەرگەوان، ئەفسەر...) دێنە ناو رووداوەکان و تێکەڵاو دەبن و کاریگەریشیان لە جووڵانی شانۆگەرییەکەدا هەیە، دیارە نووسەر ئەوانەی وەکو کۆمبارس ئەژمار کردووە بەلای ئەوەوە کۆمبارس بە کەسی کاریگەر نادرێتە قەڵەم..

## کورتە بەراوردێك لەنێوان داستانە ئەسڵییەکە و داستانەکەی (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار)دا

بەر لەوە ئەم داستانەی هەناری بەرامبەر بە داستانەکەی فیردەوسی راگرین، دەشێ ئەوە بووترێ کە کردنی داستانێکی وەها بە درامای دایگۆك هۆنراوەی کێش و سەروادار کارێکی وەها ئاسان و خۆش دەس نییە.. هۆنراوە بەو جۆرە پێی ناکرێ هەموو پێکهاتە و نەژادەکانی داستانێکی وەها چڕوپڕ لەناو خۆیدا کۆبکاتەوە، لە کاتێکدا ئەو جۆرە هونەرە لەناو ئەدەب و هونەری کوردیدا نموونەی نەبووە و بەو تاقیکردنەوەدا تێنەپەڕی بوو.. هەروەها نووسەرەکەی یەکەم نۆبەرەی بووە لەو بوارەدا.. لەگەڵ ئەوەشدا

کارێکی بێ وێنەی بۆ ئەدەب و هونەری کوردی سازداوە.. لێرەدا بە پێویستمان زانی کە هەندێ لایەن و گۆشەی ناو داستانەکەی زوحاکی شانامەدا هەن و لە داستانەکەی (دوا ڕۆژی دەئاك)دا نین بیانخەینە روو، کە ئەمانەن:

١ـ ئاشپەزەکەی زوحاك: ئەم ئاشپەزە لە شانۆگەرییەکەی هەناریدا تەنیا ئەوەیە کە سەرشانی دەئاك ماچ دەکات و لە شوێن ئەو ماچانە دوو مار دەڕوێن.. کەچی ئەم ئاشپەزە لە داستانەکەی شانامەدا، گەلێ رۆڵی تر دەگێڕێ، لەوێدا ئەهریمەنە و خۆی دەکات بە ئاشپەزی تایبەتی دەئاك و لە کارەکەی خۆیدا شارەزا و کارامەیە، خواردنی خۆشی وا بۆ زوحاك ئامادە دەکات کە قەت شتی وای نەچەشتبێ، بەو بۆنەوە خەیلێ لێی نزیك دەبێتەوە، ئەوەندە لێی نزیك دەبێتەوە داوای هەر شتێکی لێ بکات بێ دڵی نەکات، رۆژێك داوای لێ دەکات هەر دوو شانی رووت بکات بۆ ئەوەی ماچیان بکات، لە شوێن ئەو ماچانە دوو مار پەیدا دەبن و ئەویش واتە ئەهریمەن لە چاو بزر دەبێ.

هەر ئەم ئەهریمەنە کە ئاشپەزەکەی جارانە، خۆی دەکات بە پزیشکێکی گەڕۆك و رۆژی مۆخی دوو گەنج دەکاتە دەرمان بۆ دامرکاندنی مارەکانی سەرشانی زوحاك، جارێکی تر دەچێتە خەونییەوە وای تێدەگەیەنێ کە (کە پەتی لە مل خراوە و سواری حوشترێکی لەڕ کراوە و منداڵە وردەڵە بە دووی کەوتوون و شار بەدەر دەکرێ).. کەس ناوێری راڤەی ئەو خەونەی بۆ بکات، هەمدیسان ئەهریمەن خۆی دەکاتەوە حەکیم و خەوننامەزان و دێتەوە لای و پێی دەڵێ: (لەم مانگەدا منداڵێك لەدایك دەبێ دەبێتە سەرەخۆرەی تۆ.. ئەوە راڤەی خەونەکەتە)..

ئەویش لە قەڵەمڕەوی خۆیدا هەر منداڵێك كە لەدایك دەبێ دەیكوژێ.. ئەم دەورانە كە ئەهریمەن دەیانبینێ لەناو (دوا ڕۆژی دەئاكی زۆردار)دا نین..

٢ـ شالیار ئەرمایل و شالیار كەرمایل! ئەم دوو پیاوە ڕەندە هەردووكیان لەناو ئاشپەزەكەی دەئاكدان و كار و فرمانیان خواردن ئامادەكردنە.. بەزەییان بە گەلدا دێتەوە، ڕكیان لە ستەمكاری زوحاكە.. هەر ڕۆژێ دوو گەنج دەبرێنە لایان بۆ ئەوەی سەریان ببڕن و مۆخەكانیان دەرخواردی مارەكانی سەر شانی زوحاك بدەن، ئەوان لەو دوو گەنجە یەكێكیان سەردەبڕن و یەكێكیان دەشارنەوە لەجیاتیدا بزنێك سەردەبڕن، ئەو یەكەیان بە دزییەوە ڕەوانەی ناو شاخ و چیا دەكەن، ئەوەندە زۆر دەبن لەشكرێكیان لێ دروست دەبێ...

ئەمەی ئەو دوو شالیارە دەیكەن لەناو (دوا ڕۆژی دەئاك)دا ئەو دەورەیان نەدراوەتێ..

٣ـ (فرانگ) ناوی ئافرەتێكی ڕەسەن زادەیە و یەخسیرە و زكی پڕە و نۆ مانگە و نۆ ڕۆژەیەتی، لەو مانگەدا منداڵێكی دەبێ ناوی دەنێ (فەریدوون) لە ترسی كوشتنی دایكەكەی دووری دەخاتەوە، كە گەورە دەبێ، دەزانێ زوحاك بنەماڵەی ئەوی كوشتووە و دایكی یەخسیر كردووە، لەشكر پێكەوە دەنێ و لەگەڵ كاوەی ئاسنگەردا تەخت و تارای زوحاك دەڕووخێنن و دەبێتە پاشا و دەچێتە سەر تەخت[1].

لە دراماكەی (دەئاكی زۆردار)ی هەناریدا دوای ڕووخاندنی زوحاك (فەریدوون) دێتە ناوەوە، بەبێ ئەوەی رابردوویێكی لەناو دراماكە هەبێ، كاوە دەیكاتە سەركۆمار..

---

[1] بڕوانە: ئەفسانەی كاوەی ئاسنگەر و ئەژدەهاك، وەرگێڕانی: سابیر گردعازەبانی، ١٩٧٦، ل٢١-٦٧.

٤ـ گەلێ کەسانی وەکو (بێژەن، سیامەند، شالیار ئازاد، فەرهاد، سەرتیپ، پیرۆز، برزۆ، هۆشەنگ و پەشەنگ و هی تریش) خراونەتە ناو دراماکەی (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار)ەوە، کە لەناو داستانەکەی شانامەدا ناویان نەهاتووە، هەڵبەتە نووسەر ئەو کەسانەی بۆیە هێناونە ناو دراماکەیەوە، تا ئەوە پیشان بدات کە جەماوەر دەیەوێ سیستەمی کۆماری رابگەیەنێ و جەماوەر رەزامەندە.

## ئەدەبی درامی و کردنەوەی دەرگایەکی تر

(زەکی هەناری) لە نووسینی درامای (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار)دا بە هۆنراوە خۆی لە بوارێکی ئەدەبی و هونەری گرنگ و نوێ داوە. بۆ ئەو تاقیکردنەوەیەکی سەرکەوتووە و، بۆ ئەدەبی کوردیش کارێکی پێش وەختی سەردەمی خۆی بووە، پێش بەرهەمدانی کەس خۆی لە قەرەی ئەو جۆرە بابەتە و بەو شێوەیە لە ئەدەبی کوردیدا نەداوە، ئەدەبی درامی یان بابڵێین ئەدەبی شانۆگەری لە ئاقاری نووسینی کەلتووری کوردیدا بەر لە دەرچوونی ئەو شانۆگەرییە شتێکی نەزانراو و توکمە بووە، رەنگە لەم لا و لەوێ هەندێ شت لەو بابەتەدا سەریان هەڵدابێ بەڵام نەگەیشتوونەتە ئەو پلەیە شایستەی ئەوە بن ببنە بەرهەمێکی وەها لە چاپ بدرێن و رووی بڵاوبوونەوەیان هەبێ.. بۆیە ئەو بەرهەمە لە بابەتی خۆیدا بەو جۆرە داڕشتنە بە یەکەم تاقیکردنەوەی بوێرانە دەژمێردرێ و لە مێژووی ئەدەبی درامیی کوردیشدا سەر دەفتەرە و پایە و سایەدارە.

بەڵێ: ئەدەبی درامی بەشێوەی هۆنراوە تا دەرچوونی (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار)ی (هەناری) لای ئەدەب و هونەری کوردی ڕێ خۆشکەر و رچەشکێن بووە لە بەردەم کەسانێکی وەکو (عەبدولرەزاق بیمار) و (شێرکۆ بێکەس)دا ئەویان کە درامای (ئاواتی ئۆمەر)[1] و ئەمیشیان کە درامای (کاوەی ئاسنگەر)[2] بە هەمان شێوە نووسییەوە، دوو هەنگاوی بە پێز و بە تین بوون بۆ هێقم بوونی ئەو جۆرە هونەرە و دەوڵەمەند بوونی ئەدەبی کوردی..

(ئاواتی ئۆمەر)ی بیمار پاش ساڵێك بەدوای (دوا ڕۆژی دەئاك) هاتە مەیدانەوە و، واتە لە ساڵی (١٩٦١) چاپ کراوە.. (کاوەی ئاسنگەر)ی شێرکۆش لە ساڵی (١٩٧١)دا لە چاپدراوە واتە دە ساڵ پاش (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار) کەوتووە.. هەردوو دراماکە توانییان ئەو جۆرە ئەدەبە بەشێوەیەکی هونەریانەتر ئەو گۆشەیەی ئەدەب و هونەری کوردی پڕ بکەنەوە.[3]

کەوابوو پێشڕەوییەکە لەو بوارەدا هەر بۆ (هەناری) شاعیر مایەوە..

هەناری بە نووسینی (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار) لەو رووەوە کارێکی بە پێز و هێژای بۆ ئەدەبی درامیی کوردی رسکاندووە..

یەکەم: دراماکەی بە هۆنراوە داڕێشتووە..

---

[1] (ئاواتی ئۆمەر) یەکێکە لەو شانۆگەرییانەی (عەبدولرەزاق بیمار) کە لە (شانۆی کوردستان) دایە و لەساڵی (١٩٦١) بلاٌوکردووەتەوە. شایەنی باسە (شانۆی کوردستان) چەندین شانۆگەری بە شێوەی هۆنراوە لەخۆ گرتووە..

[2] (کاوەی ئاسنگەر) نووسینی (شێرکۆ بێکەس)ە لەساڵی (١٩٧١) بە چاپی گەیاندووە.

[3] بۆ زێدە زانیاری بڕوانە: درامای کوردی لەناو درامای جیهان دا بکە.. نووسینی: حەمەکەریم هەورامی..ل ٣٢٠-٣٤٦.

دووەم: بۆ بەرهەمدانی ئەو کارەی پەنای بردووەتە بەر داستانێکی میتۆلۆژی کوردی..

دارشتنی ئەو کارە بەشێوەی هۆنراوە و لە قاڵبی داستاندا سەرەتای لە مێژینەی ئەو جۆرە هونەرە دێنێتەوە یاد کە بۆ یەکەمجار هونەری شانۆگەری لەلای گریکەکان لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین سەری هەڵدا، بەم جۆرە بوو: داستانەکانیان دەکردنە دایلۆگی هۆنراوە و لە جەژنە ئایینییەکانیاندا نمایشیان دەکردن..

ئەو جۆرە شێوازە دراما نووسە کلاسیکییەکان تا سەدەی شەشەمی پاش زایین پەیڕەوییان دەکرد و لێیان لا نەدەدا، ئەو درامانووسەی لەو شێوازە لای بدایە کارەکەی بە ناپەسەند و کرچ و کاڵ تەماشا دەکرا و خاوەنەکەشی بە کەم ئەزموون و لادەر لە هێڵی ئەدەبی رەسەن دەدرایە قەڵەم!..

بەڵام ئەو جۆرە شێوازە لە سەردەمی شەکسپیردا وردە گۆڕانێکی بەسەردا هات و بەرەو دایلۆگی پەخشان ئامێز و هۆنراوەی بێ سەروا ملی نا..

تا وای لێ هات دایلۆگی پەخشان ئامێز بەسەر دایلۆگی هۆنراوەدا زاڵ بوو.. هەرچەند ئەو جۆرە تەکنیکە واتە دارشتنی دایلۆگ بە هۆنراوە، تەگەرەی گەورە دەخاتە بەردەم دەرهێنەر و کاراکتەر و جۆرە خاوییەکیش لە هەڵکشانی جووڵەی دراماکەدا دروست دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەدەبی شانۆگەری تا ئەمڕۆ دەستبەرداری ئەو جۆرە شێوازە نەبووە.. رەنگە هەر ئەوەش بووبێ بەهۆی ئەوەی کە ئەو کارەی (هەناری) تا ئەمڕۆ بە تەواوەتی نەخراوەتە سەر شانۆ..[1]

---

[1] وەکو پێبزانم هونەرمەند (صباح عبدالرحمن) ئەو شانۆگەرییەی لە ساڵەکانی شەستی سەدەی بووریدا لە هەولێر نواندووە.

هەروەهاش ئەدەبی شانۆگەریی بە گشتی لەو رۆژەوە کە سەری هەڵداوە تا ئەمڕۆش وازی لە پەنا بردنە بەر میتۆلۆژیا و داستان و ئەفسانە کۆنەکان نەهێناوە.. نەك هەر ئەوە بەڵکو شانۆگەری وەکو هونەر لە سایەی ئەواندا پەیدابووە.. بە چاوخشانێکی کەم بە مێژووی هونەری شانۆی گریکەکاندا ئەو راستییەمان بۆ دەردەکەوێ کە داستان و ئەفسانە چۆن تێکەڵاو بە هونەری شانۆ بوون.. تا ئەمڕۆش درامانووسانی هەموو دونیا وا دەکەن و پەنا دەبەنە بەر میتۆلۆژیا و لە قاڵبێکی هاوچەرخی درامیدا دایان دەڕێژنەوە و مانایەکی نوێیان دەدەنێ و نمایشیان دەکەنەوە.. ئەو بیر و باوەڕ و فەلسەفە و بۆچوونانەیان کە لە لایان رەچاو دەبن، بۆ نمایشکردنیان لەسەر شانۆ ناوەخەنی دراماکانیان دەکەن و دەیانکەن بە رەنگ و روخساری شانۆگەرییەکانیان.. هەم دراما، هەم فەلسەفە و هەم داستان کە ئەزموونێکی مێژینەی مرۆڤانەن..

دیارە گەلی بێ ئەفسانە و داستان بە گەلێکی بێ مێژوو دەدرێتە قەڵەم وەك بڵێی لە بیناکردنی شارستانیەتی ئادەمیزادا بەشداری نەکردبێ وایە..

جا لە بەستێنی ئەو بیرۆکەدا نازانرێ کە ئایا (هەناری شاعیر) لەژێر کاریگەری خوێندنەوەی دراماکانی ولآتانی دەورووبەردا پەی بەو راستییە بردووە، یان بە سەلیقەی خۆی و بیستن، یاخود زرووفی ئەو کاتە پاڵی پێوە ناوە دەست بۆ ئەو کارە گرنگە ببات؟..[1]

هەر جۆربێ ئەو کات و زرووفەی ئەو ساتەی کە دراماکەی تیا نووسیوەتەوە هۆیەکی کاریگەر بووە کە (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار) بە

---

[1] وەکو لە ژیاننامەی زەکی ئەحمەد هەناری دەردەکەوێ، ئەو زاتە جگە لە زمانە کوردییەکەی خۆی زمانی عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی زانیوە.. لە رێگەی زانینی زمانی ئینگلیزییەوە پەی بەو جۆرە ئەدەبە بردووە.

هۆنراوە دابنێ و هەردوو نەژادەکەی درامای کۆنی تیا رەچاو بکات کە: (هۆنراوە و داستانە). دیارە ئەو کارە بەو جۆرە نیشانەی هۆشیاری هەناری کورد پەروەر و شاعیرە..

ئەوەی بە وردی (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار) بخوێنێتەوە و ساڵی (١٩٥٨)ی پاش تەمووزی عیراق بێنێتەوە یاد پێی وادەبێ ئەو درامایە نەخشاندنی رەوش و زرووفی ئەو کاتەیە..

داستانی دەئاکی زۆردار، یان بڵێین: داستانی کاوەی ئاسنگەر هەڵدەگرێ لە گەلێ رووەوە لێی بکۆڵرێتەوە، خۆ ئەگەر لە هەندێ گۆشەیەوە بیدەینە بەر وردەکاری سەرنجمان هەندێ بیروڕا و باوەڕ و بۆچوونەکانی کوردەواری رابردووی کۆنمان بۆ روون دەبنەوە..

حەق وایە ئەوەش بوترێ: ئەگەر مەسەلە بگاتە سەر داستان و ئەفسانە، لە پشت ئەم داستانە رەسەنەی کوردییەوە ئەوە دەخوێنرێتەوە: کە ئێمەی کورد هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە، لە کۆن کۆنەوە راپەڕینمان دژی ستەمکاران کردووە و ئاگری شۆڕشگێڕیمان هەڵگرساندووە و خەڵکمان فێری دادپەروەری کردووە.. (رەنگە هەبێ بڵێ! تەحم!.. کو وا دەبێ!..

منیش دەڵێم: تەحم .. ئەی ئەوە نییە میللەتانی تر نانی ئەفسانە و داستانە کۆنەکانیان دەخۆن..).

## پەیکەری گشتی دراماکەی هەناری

لەپێشەوە وتمان دراماکە هەشت بەشە، نووسەر هەر بەشەی بە داستانێك ناوبردووە.. وا لە خوارەوە کورتەی دراماکە دەخەینە پێش چاو!

**له داستانی یەکەمدا:**

دەئاك دەبینین لەسەر تەخت پاڵی داوەتەوە و نۆکەر و گزیر و وەزیر دەستە نەزەری راوەستاون و روو دەکاتە هەمووان و دەڵێ:

(( له رۆژئاواوه تا رۆژهەلآت

له فەرمانمدان شار، دێ گشت ولآت))[1]

شالیار کەندرو: ئەوەندەی تر بەرزی دەکاتەوە و دەڵێ:

(( له بارەگای شا نۆکەره کەندرو

وتەی راست رەقه وا کردم له روو))[2]

شالیار ئازاد لەوێیه: ئامۆژگاری ئەژدەهاك دەکا و دەڵێ:

(( ستەم فرێ دە، بەرگی داد پۆشه

رێی بەدی بەرده بۆ چاك تێکۆشه))[3]

دەئاك له قسەکانی شالیار ئازاد پەست دەبێ، پرس به (موبید)، واته مۆغەکەی که تەمسیلی ئایین دەکات، که ڕای دەربارەی ئەو گفته ناشیرینەی شالیار ئازاد دەربڕێ.. ئەویش سنگی پڕ رییای بۆ دەباته پێشەوه و دەڵێ:

(( وتەت پێڕەوه هەرچی لێی دەرچێ

به بڕین به کوشتن به سووتن ئەچێ

سەرباز به کوشتن گەل بەسەر بڕین

پێشکار پەستار به سووتن و دڕین))[4]

---

[1] دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار. ل ٢١.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢.

[4] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥.

ئەژدەئاك بڕیار دەدا، كە شالیار ئازاد توندی زیندان بكرێ، چونكە داوای لێ كرد كە دادپەروەری بكات، كەندرو و موبید و دەست و پەیوەند كە دەزانن دەئاك ركی لە ئامۆژگارییەكەی شالیار ئازاد بووەوە، ئەوانیش لەوەدا كەوتنە راتەكی ئەو، دەئاكیان هەڵنا كە سزای بدات، بۆیە شالیار ئازاد دەربارەی كەندرو دەڵێ:

(( دڵ بەندی پوولە نۆكەری دینار

ڕێی پیاوەتی نەماوە یەك جار))[1]

دەربارەی موبیدیش دەڵێ:

((موبید زانایە، بێ هۆشە و، بێ ژیر

خۆرا خەواڵوو، ترسنوك بێ بیر))[2]

یان پێی دەڵێ:

(( لای خۆت سەرداری ئایینی كەچی

لە كار كردەوە و بڕیارتا كەچی))[3]

لەم كاتەدا.. سالار و چەند نێزەدار دێنە ژوورەوە و ملكەچی خۆیان بۆ دەئاك پیشان دەدەن..

دەئاك فرمان بە سالار دەدا كە شالیار ئازاد بخاتە زیندانەوە، ئەویش خێرا فرمانەكەی جێبەجێ دەكات..

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢.

**له داستانی دووه‌مدا:**

ئه‌ژده‌هاك هه‌ڵپه‌ی خواردنیه‌تی، که له خواردن ته‌سه‌ل و مڕ ده‌بیٚ، ستایشی (ئاشپه‌ز ـ چێشتکه‌ر)ه‌که‌ی ده‌کات.. ئه‌ویش داوای لیٚ ده‌کات که شانی رووت بکات بۆ ئه‌وه‌ی هه‌ردوو شانی ماچ بکات.. ده‌ئاك داواکه‌ی ئاشپه‌زی پیٚ سه‌یر ده‌بیٚ.. ئه‌ویش پێی ده‌ڵیٚ:

(( ماچی شانانتم ئه‌کرێته داستان
نه‌وه ئه‌یخوێنن وه‌ك نامه‌ی باستان))[١]

ماچی هه‌ردوو سه‌رشانی ده‌کات، له شوێن ئه‌و دوو ماچه دوو مار له‌سه‌ر شانی ده‌ڕوێن و وه‌رده‌بنه گیانی ئه‌ژده‌هاك، ئه‌ویش له تاو ئازار و بیٚ ئارامی ئه‌و دوو ماره په‌نا ده‌باته به‌ر ده‌ست و په‌یوه‌نده‌که‌ی..

**له داستانی سێیه‌مدا:**

ئه‌و ئاشپه‌زه که دوو ماچه‌که‌ی بوون به دوو مار، بزره و دیار نییه !

چه‌ندان پزیشك و نۆژدار، دێنه سه‌ری، به‌ڵام ئه‌و دوو ماره‌یان پیٚ دانه‌مرکانه‌وه.. یه‌کێکیان هه‌ر دوو ماره‌که‌ی ده‌رهێنان به‌ڵام پاش ژه‌مێك خواردن سه‌رله‌نویٚ ده‌رهاتنه‌وه..

(( ئه‌بڕا، ئه‌بوه‌وه، ئه‌پچڕا ئه‌ڕوا

---

[١] سه‌رچاوه‌ی پێشوو. ل٣٧.

مار چارەی نەکرا مایەوە هەروا ))[1]

مارەکان بە بڕین و هەڵکەناندن لە کۆڵ نەدەبوونەوە، رەگیان لەناو هەموو لەشیدا داکوتابوو..

لەدواییدا پزیشکێکی گەڕیدە پەیدا دەبێ.. بە دەئاک دەڵێ ئەم مارانە هیچ چارەیەکیان نییە ئەوە نەبێ کە مێشکی مرۆیان دەرخوارد بدرێ..

(( خۆراکیان مێشکە مێشکی سەری مرۆ

چێشت و ئێوارە و کاتی نیوەڕۆ

هەر رۆژ پێویستە مێشکی دوو جوان

خواردەی رۆژیان بێ و ئامادەکرێ جوان ))

داوا لە (موبید) دەکرێ کە فتوای ئایینی لەسەر قسەی پزیشکەکە بدات، بۆ ئەوەی کە هەر رۆژەی مێشکی دوو گەنج بکرێن بە خۆراکی مارەکان، ئەو کات خەڵك نەوێرن دەنگ بکەن و ئەو کارە بە واجیبێکی ئایینی بزانن..

مۆبید:

(( وا بڕیارم دا بۆ گیان پارێزی

شا، بکەن هەرچی ئەیەوێ مگێزی ))

بەپێی ئەو فتوا ئایینییەی موبید، رۆژی دوو گەنج سەر دەبڕێن و مۆخەکانیان دەرخواردی مارەکانی دەئاك دەدرێن..

---

(1) سەرچاوەی پێشوو، ل٤١.

**لە داستانی چوارەمدا:**

سەرتیپ برزۆ دێتە لای دەئاك و كڕنۆشی بۆ دەبا و، پێی رادەگەیەنێ كە ولأتی جەمشید گیرا و چی كوڕ و كچ و ماڵ و منداڵیان هەبوو هەمووی بە دیل گیران و بە تالأن هێنران، وا لە تەك خۆیا دوو كیژەكەی جەمشید (شەهرەناز و ئەرنەوان)ی بە خەلأت بۆ شای هێناون.. هەر دوو كیژەكە لەبەردەم ئەژدەهاكدا دەست دەكەن بە گریان و خۆلاواندنەوە، ئەو گریان و پاڕانەوە ئەوەندەی تر ئالۆشەكانی دەئاك دەهورووژێنن..

**لە داستانی پێنچەمدا:**

خەڵك لە ستەمكاری و كوشتن و بڕینی ئەژدەئاك بە تەواوی بێزار بوون. وا هەندێ گەنج دەمامكیان لە دەم و چاوی خۆیان پێچاوە و بەناو كووچە و كۆلأنەكاندا دەگەڕێن و هانی خەڵك دەدەن كە نارەحەتی خۆیان لە دەست ئەو ستەمكارە دەربڕن و نەترسن، خەڵك فێر دەكەن كە دژ بە ستەمكار راپەڕن.

وا فیرۆز، پەروێز، سیامەند، پەشەنگ، هۆشەنگ، فەرهاد، بێژەن، خەریكی راچنینی خەڵكن..

پیرۆز كچێكە تائێستا نۆ برای دەرخواردی مارەكانی دەئاك دراون، بە هاوار و گریان دێتە لای ئەو گەنجانە و دەڵێ:

(( مێشكی هەر نۆ برام بوون بە خۆراكی

هەر دوو مارانی شانی دەئاکی ))[١]

هەموو سوێند دەخۆن تا مێشکی دەئاك نەپژێنن دانەنیشن..

**لە داستانی شەشەمدا:**

لەم داستانەدا، دەئاك، موبید، شالیار، کەندرو، شالیار کەرمایل، شالیار ئەرمایل، گەلێك ئەفسەری مەزن و پلەدار کۆبوونەتەوە بۆ ئەوەی پەیمانی ئەمەکداری و وەفا سەرلەنوێ بۆ دەئاك مۆر بکەنەوە کە دژ بە وانە راوەستن کە دژی شا ئاژاوە دەگێڕن..

دەئاك وتارێ دەدا و دەڵێ:

(( لەسەر ئەم چاکە ئەڵێن چەند خوێڕی

گەل وا هان ئەدەن لێم بکەونە زویری ))[٢]

پاش دەئاك شالیارەکانیش وتاریان دا، هەندێکیان ناڕەزاییان دەربڕی و هەندێکی تریان وەکو دانایەك دوان.. نۆبە هاتە سەر (موبید) و وتی:

(( خوا پێمان ئەڵێ لە نامەکەی پاك

ملی کەچ، بۆمە و بۆ سەرۆکی چاك ))[٣]

**لە داستانی حەوتەمدا:**

لەم داستانەدا کاوە و کوڕەکەی دێنە ناو بازاڕ و هاوار دەکەن:

---

[١] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٥.

[٢] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٠.

[٣] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٧.

(( داد لە دەست ستەم چینانی بازاڕ
بۆ ئێوە ئەکەم هاوار پڕ بەزار ))[1]

خەڵك لە دەور کاوە و کوڕەکەی کۆ دەبنەوە و دەخرۆشێن، هەریەکە دێتە پێشەوە و هاواری خۆی دەخاتە سەر هاواری کاوە..

کاوە بەروانکەکەی ـ پێشکۆشە، کە دەکاتە ئالاّ و بەسەر نێزەکەیەوە دەکات، خەڵك دەهرووژێن و دروشمی شۆڕش و ڕمانی قەلاّی ستەمکار بەرز دەکرێتەوە و روو دەکەنە کۆشك و دەرباری شا و تەخت و تارای سەرنخوون دەکەن، بە چەکوشەکەی دەستی کاوە سەری دەئاك پان دەکرێتەوە..

(( هەڵگری ئالاّ کاوەکەی ناودار
چەکوچی لە دەئاك دا و هێنایە خوار ))[2]

**داستانی هەشتەم:**

دوای کوشتنی دەئاك و رووخاندنی قەلاّی ستەم، سەرانی شۆڕشەکە کۆبوونەوە، (کاوە، فەریدوون، شالیار ئازاد، شالیار کەرمایل، شالیار ئەرمایل، شازادە شەهرناز، شازادە ئەرنەواز، پیرۆز، فەیرۆز، پەروێز، هۆشەنگ، پەشەنگ، بێژەن، فەرهاد، سیامەند) هەریەك دەربارەی شۆڕش و سەرکەوتنەکەی قسەی خۆی دەکات. شالیار ئازاد داوا دەکات کاوە بکرێ بە سەرکۆمار.

(( کاوە ئازایە و بەهێزە و هۆشدار

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٧.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٠.

شاهی نەمێنێ بێتە سەرکۆمار

کۆمار هی گەلە کەس نایکا داگیر

وەك شاهی نییە شا خۆی لێ کا گیر ))[1]

هەموو پێشنیارەکەی شالیار ئازادیان لا پەسەند دەبێ، بۆیە بڕیار دەدەن کە کاوە بکرێ بە سەرکۆمار، کاوەش روو دەکاتە هەموویان و دەڵێ:

(( سوپاستان ئەکەم برایانی مەرد

بژین بە خۆشی دڵتان نەگرێ گەرد ))[2]

ئەو وای پێ باشە بە بازووی خۆی بژێوی بۆ خۆی و منداڵی پەیدا بکات، نەك لەسەر تەخت دانیشێ و پاڵ بداتەوە.. بۆیە پایەی سەرکۆمار بە (فەریدون) دەبەخشێ و دەڵێ:

(( لەنێو گەل نەبووە کەس وەك فەریدوون

ساڵەها جەنگ کا، بەبێ چەند و چوون

ئەو سەرکۆمارییەی پێتان دابووم باش

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٤.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٩.

سوپاس وا بەخشیم بۆ ئەو بێ پاداش ))[1]

ئیتر خەڵکەکە بە یەك دەنگ پێشنیارەکەی کاوە قبوڵ دەکەن و دەڵێن:

(( پەسەندی دەکەین گشتمان بە یەك جار

فەریدوونی مەرد بێتە سەرکۆمار ))

فەریدوون سوپاسی جەماوەر دەکات و دەڵێ:

(( سوپاستان دەکەم برایانی کار

لەمەی کە منتان کرد بە سەرکۆمار ))

فەریدوون بوو بە سەرکۆمار و (مامۆستا هەناریش) ئەم دراما جوانەی پێشکەش بە کتێبخانەی ئەدەب و هونەری شانۆگەریی کوردی کرد..

## گرێی ناو دراماکە

١- بوونی گرێ (plot) مەرجێکی سەرەکی سەرکەوتنی هەر شانۆگەرییەکە، کەچی لە درامای (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار)دا تا نەگەیتە داستانی چوارەم کە ناوەڕاستی کارە هونەرییەکەیە، هەست بە هیچ ناکۆکییەکی ئەوتۆ لەنێوان ئەو کەسانەدا کە بەرچاوت دەکەون ناکەیت، هەر

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٠.

چوار داستانەکەی پێشەوەی بۆ ناساندنی دەئاك و دەست و پەیوەندەکەی تەرخان کراون، شالیار ئازادی لێ بوێرکەی کە لەبەر یەك وتەی راست خرایە بەندیخانە ئەوانی تر لەناو خۆیاندا تەبان و هیچ ناکۆکییەك لەنێوانیاندا نییە، پاش داستانی چوارەم کە پزیشکە گەڕۆکەکە رۆژی مێشکی دوو گەنج دەکاتە دەرمان بۆ مارەکانی سەر شانی دەئاك و (موبید)یش فتوای سەربڕینی رۆژی دوو گەنج دەدا، لەوێدا تۆوی دووبەرەکی لەنێوان دەئاك و گەلدا دەچێنرێ و دەبێتە زەمینەیەك بۆ دروست بوونی گرێی درامی، هەر لەوێشدا جۆرە بەربەرەکانییەکی پەنهان وەکو سکڵی بن ژیڵەمۆ دەکەوێتە جووڵە. رۆژ دوای رۆژ لەناخی گەلدا چەکەرە دەکێشێ، لە داستانی حەوتەمدا کڵپە دەدا و قڵیشێك لەنێوان ئەو دوو بەرەدا دروست دەبێ، چونکە کەس نامێنێ چەندین جار لە دەست ئەو ستەمکارە جگەر سووتاو نەبێ.. زۆری پێ ناچێ گرێکە لە پەنای ئەو بەربەرەکانێی ئەو دوو لایەنەدا خۆی لە کرژی دەدا و ئاشکرا دەبێ، واتە رکەبەرێ لەنێوان ئارەزووەکانی دەئاك و قینی خەڵکەکەدا وەکو ئاگری بن کا، دووکەڵی لێ بەرز دەبێتەوە، کەسانی ناو شانۆگەرییەکەش دەبنە دوو بەرەی دژ بە یەك، بەرەی گەل و بەرەی دەئاك.

لایەنی دەئاك مێشکی دوو گەنجیان دەوێ، ئەوانیش لەوە زیاتر ئەوەیان پێ قبوڵ ناکرێ..

گرێی درامی "جاری وا هەیە لە ئارەزووەکانی پاڵەوانی سەرەکییەوە سەرهەڵدەدا دەیەوێ بەو مەبەستانە بگات کە رێگەی هێنانەدییان پڕە لە تەگەرە و ئاستەنگ، ئیدی ئەو ئاستەنگانە بەرەنگاری کردنی خەڵکانی تر بن، یان تەگەرەی سروشتی بن.. یان دەکەوێتە نێوان مەبەستەکانی دوو لایەنەوە: لایەنی خەیر و لایەنی شەڕ.. کە هەر یەکەیان خۆی بە لایەنی خەیر

دەزانێ و ئەویتر بە شەڕ، یان بڵێین حەق و ناحەق، یان ستەمکاری و دادپەروەری، وەکو لە درامای (دوا ڕۆژی دەئاك)دا هەستی پێ دەکرێ، بەڵام (درامای سەرکەوتوو ئەوەیە لە یەکەم هەنگاویەوە هەست بە ناکۆکی کەسەکانیدا بکەی..)[1].

درامای (دوا ڕۆژی دەئاك) تا دەگەیتە داستانی چوارەمی پێت وایە (بەیت ـ بەیان) دەخوێنیتەوە..

٢ـ وتارە دایلۆگ ئامێزەکانی شالیارەکان و کاوە و سەربازەکان و پزیشکە گەڕۆکەکە و دەئاك خۆی، ئەوەندە درێژە بە دایلۆگە شیعرییەکە دەدەن، خوێنەر ئەوەی لە بیر دەچێتەوە کە لەناو درامادایە و هونەری درامی دەخوێنێتەوە..

دیارە یەکێکی تری لە مەرجە سەرەکییەکانی ئەدەبی درامی ئەوەیە بە خێرایی دیمەنەکانی ناوی بگۆڕدرێن و بەرەو هەڵکشانی ڕووداوێکی پێشبینی نەکراوە ڕاپێچت بکەن..

٣ـ لە داستانی سێیەمدا ئاشپەزەکەی دەئاك کە دوو ماچی سەرشانی دەئاك دەکات لە شوێن ئەو دوو ماچە دوو مار دەڕوێن.. ئەمە هێمایەکی جوانە و لە ئەسڵی داستانەکەدا هەیە. بەڵام درامانووس بۆی هەیە لە دراماکە بۆ گەلێ مەبەست بەکاربێنێ و مانایەکی هاوچەرخیان بداتێ، بۆ نموونە دەکرێ ئەو دوو مارە بکرێن بە:

**یەکەم**: ئەو دوو مارە نەفرەت بوونی خەڵکە بووە بەو دوو مارە و ئۆقرەیان لە دەئاك بڕیوە.

---

[1] (النقد الادبي، موسوعة احمد أمين الادبية) دار الكتاب العربي، بيروت، ١٩٦٧، ل ١٥٩.

**دووەم**: یان مارەکان هێمان بۆ ئەو ئارەزووە ئاژەڵییانە کە هەرگیز تەسەل بوونیان بۆ نییە..

ئەوەتانی (هەناری) پەی بەو راستییە بردووە و ئاماژەیەکی ئاستەم بۆ ئەو مەگێزە ئاژەڵییانە دەکات و لەسەر زاری (موبید) دەڵێ:

(( وا بڕیارم دا بۆ گیان پارێزی

شا، بکەن هەرچی ئەیەوێ مەگێزی ))[(١)]

وشەی (مەگێز) نووسەر بە هەر مانایەکی وەرگرتبێ ئەوەشی لێ دەخوێنرێتەوە کە (مەگێز) ئەو پاڵنەرە ئاژەڵییە بێ کە پەروەردە ناتوانێ بیگۆڕی و قەت تەسەل بوونیشی بۆ نییە..

**سێیەم**: هەندێ کەسانیش وا لێکی دەدەنەوە ئەو دوو مارەی سەرشانی دەئاك بریتی بوون لە نەخۆشی شێرپەنجە چونکە چەندین جار بڕدراون و سەرلەنوێ سەریان هەڵداوەتەوە..

٤ـ پاڵەوانانی داستانەکەی (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار) دوای سەرکەوتنیان پێشنیاریان کرد (کاوە) بکرێ بە شا.. کەچی هەندێ لەو کەسانە دێنە

---

(١) (دوارۆژی دەئاکی زۆردار) ل(٤٧)..

نووسەر لە داوێنی لاپەرەی (٤٧)دا، مانای مەگێزی بە ئارەزوو لێك دەداتەوە.. من هەر لە زووەوە وشەی "مەگێز"م بە "الغريزة" عەرەبی لێکداوەتەوە و لە زۆر نووسینمدا ئەو مانایەم داوەتێ.. مەگێز ـ الغريزة ـ لە ئاژەلأندا بەرامبەر بە پاڵنەرە ـ الدافع ـ لای ئادەمیزاد، پاڵنەر پەروەردە کاری تێ دەکات و سفت و سۆی دەکات، کەچی "الغريزة" پەروەردە کاری لێ ناکات و توانای فێربوون و گۆڕانی نییە..

پێشەوە و داوا دەکەن ببێ بە سەرکۆمار نەك شا.. ئەوەتانی نووسەر لەسەر زاری ئەو کەسانە دەڵێ:

(( بۆ ئەم ئامانجە و پاداشی کاوە

کاوە بێتە شا بڕیارم داوە.. ))

شالیار ئازادیش دێتە پێشەوە و دەڵێ:

(( کاوە ئازایە و بەهێزە و هۆشدار

شاهی نەمێنێ بێتە سەرکۆمار ))

(( کۆمار هی گەلە کەس نایکا داگیر

وەك شاهی نییە شا خۆی لێ کا گیر ))

شالیار کەرمایل، شالیار ئەرمایل، فەیرۆز، پەروێز، هۆشەنگ، پەشەنگ، بێژەن، فەرهاد، شازادە شەهرناز، شازادە ئەرنەواز، سیامەند.. ئەمانە هەندێکن لەو کەسانەی ناو دراماکەی (هەناری) هەموویان بڕیار دەدەن کە (کاوەی ئاسنگەر) ببێ بە سەرکۆمار ئەویش دەڵێ:

(( سوپاستان ئەکەم برایانی مەرد

بژین بە خۆشی دڵتان نەگرێ گەرد ))

هەتا دەڵێ:

(( لەنێو گەل نەبووە کەس وەك فەریدوون

ساڵەها جەنگ کا، بەبێ چەند و چوون

ئەو سەرکۆماریەی پێتان دابووم باش

سوپاس وا بەخشیم بۆ ئەو بێ پاداش

دڵ پاك، ئازایە، چاو تێر و مەردە

نەژاد خاوێنە بە راستی کوردە ))[1]

هەموو بە یەکجار دەڵێن:

(( پەسندی ئەکەین گشتمان بە یەکجار

فەریدوونی مەرد بێتە سەرکۆمار ))

لە کۆتایی دراماکەدا کاوە ئەم درۆشمە بەرز دەکاتەوە و دەڵێ:

(( ئیمڕۆ کە جەژنە، جەژنی نەورۆزە

جەژنی ئازادی و شایی و پیرۆزە ))

٥ـ کەسانی ناو ئەم درامایە، لە گفتوگۆدا هەموویان لەسەر یەك تیلمە و نەزم و لۆجیك دەکەونە ئاخاوتن، جیاوازی لەنێوان وتەکانی سەربازێك و دەئاکدا نییە.. هەموو لەبەر خۆیانەوە قسە دەکەن..

ئەگەر سەرنجێکی دوا لاپەڕەکانی (دوا ڕۆژی دەئاك) بدەین بۆمان دەردەکەوێ هەناری کودەتایەکی لە داستانەکەی فیردەوسیدا کردووە:

١ـ جەماوەرێکی زۆری تیا خڕ کردووەتەوە کە گەلێکیان هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لە ڕووداوەکاندا نییە.

٢ـ ڕژێمی ناو مەملەکەتی داستانەکەی فیردەوسی کە ڕژێمی پاشایەتییە کردووە بە ڕژێمی کۆماری..

٣ـ فەریدوون کە لەناو داستانەکەی فیردەوسیدا لەشکەرکێشی دەکات بۆ سەر دەئاك و لە بنەڕەتدا شازادەیە.. لەناو دراماکەی هەناریدا تا سەرکەوتن بەسەر دەئاکدا دیار نییە و هیچ ڕۆڵێك نابینی و لەپڕ پەیدا دەبێ و کاوە سەرکۆماری بەو دەبەخشێ چونکە کوردێکی نەژاد پاکە..

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٤ ـ ١٠٧.

## سەرچاوەکان

١ـ دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار.

٢ـ شانامەی فیردەوسی.

٣ـ موسوعة ئەحمەد ئەمین.

٤ـ درامای کوردی لەناو درامای جیهاندا.

# ملخص البحث

## بداية ظهور الفن الدرامي الكردي بالاسلوب الشعري

### حمه كريم هورامي

يتناول هذا المقال بالبحث والتحليل بداية نشوء فن الكتابة المسرحية الشعرية باللغة الكردية مستشهداً بأول قصة درامية كتبها ونشرها الكاتب الشاعر (زكي احمد هناري) سنة (١٩٦٠). ولم يسبق لها مثيل.

واصفاً اياها بانها اصبحت الاساس المتين لهذا النوع من الكتابة، والتي اضافت تجربة جديدة للكتابة الكردية وفناً غير معروف لدى كتاب الكرد. وبيّن المقال ايضاً كيفية استخدام الكاتب للاسطورة الكردية ومعالجتها كموضوع لمسرحيته هذه من جانب وكتابة حوارها شعراً كأداة لبنائها من جانب آخر وقد حالفه النجاح في كلتي الحالتين.

وانّ هذه التجربة الجديدة في هذا المضمار قد اعادت الى اذهان الدارسين المتتبعين لهذا النوع من فن الكتابة ماكان يستخدمه الكتاب المسرحيون الاوائل ايام نشوئها في كنف ازدهار الحضارة اليونانية حيث كانوا يعتمدون في كتابة اعمالهم المسرحية على الاسطورة اولاً وعلى الحوار الشعري ثانياً. فيرمون من وراء ذلك احياء تراثهم العريق الى جانب صقل قريحة مشاهيدهم بالشعر الرصين وامتاعهم في اطار هذا الفن الاصيل.. وعلى منوالهم هذه قد اصاغ كاتب مسرحية (دوا ڕۆژی دەئاکی زۆردار) مسرحيته هذه، لذا عدّ الكاتب من رواد نقل هذه التجربة الفنية الى الادب الكردي، مقتدياً نفس الاسلوب والاداء ولم يسبق لايّ كاتب من كتاب الكرد، ان مرّ قبله بهذه التجربة ولهذا يعتبر تجربته بداية ظهور الفن الدرامي الكردي بالاسلوب الشعري. علماً بان هذه المسرحية ترجمت الى اللغة العربية بعنوان (نهاية الطاغية) والمترجم هو الدكتور المرحوم (فخري الدباغ).

## Abstract

### The emergence of Kurdish deamatic poetry

**Hama Kareem Hawrami**


The study deals with the first appearance of dramatic poetry, quoting (Zeki Ahmad Hanari's) poet and writer which was first published in 1960.

This dramatic poetry of Hanari's has formed the basis for this kind of writings, unknown to Kurdish writers yet.

The study also sheds light on the capability of the writer to use Kurdish legends as the subject of the dramatic poetry successfully.

This new experience of our poets, reminded the studiers of Greek poets and how they invested legened to write dramatic poetry and in this manner our poet wrote his dramatic poetry (The Last days of Zaak the Tyrant). So Hanari is regarded as a pioneer. This work was translated into Arabic by Dr. Fakhri Al-Dabag entitled (The End of a Tyrant).

ئەتیمۆلۆجیا:

# وەرگەڕانا دەنگێ /ڤ/ ل پێشییا پەیڤێن زمانێ کوردی

فازل عومەر

## کورتی

ئەڤ لێکۆلینە بزاڤێ دکەت لسەر، وەرارا دەنگێ /ڤ/ ل پێشییا پەیڤێن کەڤنە زمانێن ئاری بۆ دەنگێن /ب/ د زمانێ کوردیدا، راوەستت و دیار بکەت کو ئەڤ وەرارە ژبەر هندەك ئەگەرێن مێژوویی یان باندۆرا دەرڤە سێ رێکێن جودا گرتینە.

ب گشتی، ل هندەك زارێن زمانێ کوردی نەخاسمە ل (زازاکی و هەورامی) وەکو خوە مایە یان بوویە /و/. ل کرمانجی ب هەردوو شاخێن خوە ڤە بوویە /ب/ یان /گ/ دگەل هندەك ڤەدەران.

د ئەنجام دا دیار دبت کو ئەڤ وەرگەڕانا دەنگێ /ڤ/ ل پێشییا پەیڤان ژبەر هەر ئەگەرا هەبت، کۆك و ئێك ـ تەرز نەبوویە و نەشێت ببتە بناغەیەکا زانستی بۆ هلسەنگاندن و ڤاڤارتنا زارێن زمانێ کوردی، نەژی دبتە بناغەیەك بۆ جوداکرنا زمانێ کوردی ژ زمانێن هەمان بنەمالێ.

# پێشگۆتن

تاکو سەد سالیيا بيست، ژبلی هندەك بزاڤێن کەسی و پرت و بەلاڤ، کوردان چو يێ هەژی بۆ زمانێ خوە نەکریە[1] و گەڕیدەیێن ئەورۆپی ژی گەنگەشە دکرن کانێ زمانێ کوردی سەربخوەیە یان زارەکێ زمانێ فارسییە.

ل سەد سالیيا بیستێ، نەخاسمە پاش جەنگا جیهانی ئێك، زمانێ کوردی وەکو زمانەکێ سەربخوە ل کۆچك و دیوانێن ئەکادمیان هاتە ناسکرن و ناڤێن دیار خزمەتا وی کرن وەکو مینۆرسکی، مەکێنزی، قەناتێ کوردۆ، تەوفیق وەهبی، جەلادەت بەدرخان، و پاشی ل وارێ ئەتیمۆلۆجیایێ مەسعوود محەمەد و حەسەن قزلجی و د. جەمال رەشید و یێن دی بنەمایەکێ باش بۆ پاشەڕۆژێ دانا.

لێ هێشتا ئەتیمۆلۆجییا زمانێ کوردی ل بەندا کارەکێ زانستی و بەرفرەه مایە کو بشێت خەریتەیەکا زمانێ کوردی لسەر خەتەکا مێژوویی دانت داکو بەری هەر تشتی ژێبوون و وەرارا زمانی بهێنە زانین و پاشی توخم و ژێدەرێ پەیڤێن فەرهەنگا وی بهێنە دیارکرن. هەلبەت ئەڤە ژی ب لسەرێك ئاڤاکرنێ و کارێ کۆمەکا زمانزانێن خەمخوەر دێ هێتە ئەنجامدان، و تاکو ئەو رۆژە دهێت گێزگێزا هەر کەسەکی دبتە بنسترا پاشەرۆژێ.

[1] ژبلی رێزمانا ئەرەبی ب زمانێ کوردی یا عەلی تەرەماخی، نووبهارا بچووکان و قامووسا ئەحمەدی و هندەك فەرهەنگێن دی کو هێژا عەلی قەرەداخی دەستخەتێن وان ل دەستخەتخانا بەغدا دیتینە و هێشتا چو ژێ نەهاتیە زانین، زانایێن کورد گەلەك خزمەتا زمانێ خوە نەکریە.

لەو ئەڤ گوتارە بزاڤەکە بۆ رێخوەشکرنێ ل ئەڤێ رێکا دوور و درێژ. نەخاسمە زانینا ئاوایێ گوهەڕینا دەنگان و مانایا پەیڤان، رێکا ئێکانەیە بۆ تێکڤەدانا زەڤیا پەیڤان و دیارکرنا ئاوایێ پێشکەڤتن و گوهاڕتنا فۆرم و مانایێن وان.

هەلبەت وەج وەرگرتن ژ ئەزموونێن بەرێ و هەڤبەرکرنا پەیڤێن کوردی دگەل یێن زمانینێن دی، چ یێن هەمان بنەمالێ چ یێن دی، دشێن ببنە هێڤێنێ خەباتەکا هەژی. بۆ نموونە، هەر کەسێ سەرڤەسەرڤە ل زمانێ کوردی و فارسی بنێڕت دێ هندەك هەڤبەندییان وەکهەڤییێن ژێکجودا بینت، بنێڕە:

**فارسی: داماد، زمین (زەمین)، نماز (نەماز)، بادام، کمان (کەمان)، دم (دەم)**
**کوردی: زاڤا/زاوا، زەڤی/ زەوی، نڤێژ/نوێژ/نمێژ، باهیڤ، کەڤان/کەوان، دەڤ(دم).**

ل ڤر /ڤ/ئو/و/ یێن کوردی زمانێ کوردی ژ /م/ یێن فارسی جودا دکەن و هەڤبەندیێ ژی دپەژرینن، چونکی وەکو فۆرم و مانا هەردوو دەستەکێن پەیڤان ئێکن لێ ل تۆ نەکێ /ڤ - و/ بەرانبەر /م/ ژێکجودانە... ب ئەڤێ ژێکجودابوونێ هەر زمانەك سیمایەکی دستینت، هەکەرچی تێکەلی ژی مایە، وەکو هەبوونا دەڤی و دمێ فرندەیان یان تۆڤی و توخمی ب دو مانایێن جودا د زمانێ کوردیدا.

ئەڤ نموونە دشێت ببتە بیاڤێ لێکۆلینێ و باشترین و سادەترین نموونە بۆ ڤەخواندنێ و دیارکرنا توخمێ پەیڤان، چ هاتبنە وەرگرتن یان ب ئاوایەکێ سروشتی زمانی د ناڤ خوەدا وەرار کربت.

## ناڤەڕۆك

بەری هەر تشتی، پێدڤییە ئەم بەرسڤا پتر ژ پرسیارەکا گومانبڕ بدەین، داکو پشتڕاست ببین ئەم لسەر رێکا دروستین:

ـ ئەریَ چ بەلگە هەنە کو دەنگێ ئەم هزر دکەین هاتیە گوهەڕین؟ ئانکو ئەڤ دەنگە د کوردییا دێریندا هەبوو و پاشی ئەو زنجیرا وەرگوهەزینێ بسەردا هاتیە و دەنگێن ئیرۆ ئەم پێ دئاخڤین ژێ ماینە؟ کی دبێژت بەرەڤاژ دروست نەبوویە؟

**هەلبەت سێ راستی هەنە خوە دکەنە پشتەڤانێن بەرسڤا ئەرێنی:**

١ـ پەیڤێن کەڤنە زمانان: نەخاسمە پەیڤێن کەڤنە زمانێن ئاری یان هند ـ ئیرانی یان هند ـ ئەورۆپی کو زمانێ کوردی ل دێرزەمان ژێ پەیدابوویە، وەکو زمانێ ئاڤێستایی، هەخامەنشی، پەرتی و پەهلەڤی یان یێن دوورتر وەکو سانسکریت، لاتینی، گریکی[٢].

---

(٢) واریَ ئەتیمۆلۆجی و هەڤبەرکرنا زمانێن ئێك ـ بنەمالێ وەکو هلێڤڕینا شوونوارانە، دشێت ببتە بناغەیەکا گرنگ بۆ ڤەخواندنا مێژوویێ د زمانیدا. بۆ نموونە وەرگەڕانا دەنگان وەغەرەکا ب مەرەقە بۆ هەر زمانزانەکی تاکو بگەهتە راستییا پەیدابوونا ئەڤان پەیڤێن جودا ژ پەیڤەکێ: Therme گریکی، Formus لاتینی، Warm ئنگلیزی، Germ ـ گەرم کوردی... ئەریَ چاوا ئەڤ دەنگێن جودا ژ دەنگەکی پەیدابووینە؟ بەرسڤێ وەغەرەکا درێژا هزری و دۆکیۆمەنتی و بینادنێ دڤێت.

بۆ نموونە: ڤیز، ڤیپ، ڤیچ، ڤۆیس، ڤەرکە، ڤەرازە، ڤات[٣].

٢ـ پەیڤێن زمانێ کوردی: د پەیڤێن لێکدایدا سیبەرا کەڤن دهێتە دیتن، نەخاسمە، دەما پێشگرەکی رێ لبەر گوهەڕینا ژێگۆتی گرتبت، بۆ نموونە، دەنگێ /ڤ/ یان /و/ هێشتا ل پەیڤێن ڤەوژارتن، کەڤر... دهێنە دیتن، هەکەرچی نهۆ پەیڤێن سەربخوە وەکو ڤە ـ بژارتن، کە(ی)ـ بەر(د)... دهێنە گۆتن.

٣ـ قانوونا گریم[٤] و یێن پاش وی هاتین.

ب گـۆرەی ئەڤان هـەرسێ راستیـیان ئـەم دکـارین پشتڕاست بین کو دەنگ ـ گهۆڕینەك ل مێژوویێ قەومیە و ئیرۆ دهێتە دیتن.

ل خوارێ چەند نموونەیان ژ زمانێ ئاڤێستایی و یێن دی، د نەخشەیەکیدا دێ ریزکەین بۆ دیتنا ئەڤێ دیاردەیێ، پاشی دێ بزاڤێ کەین ل هنداڤ راوەستین و ئاوایێ گوهەڕینێ یان ڤاڕێبوونێ ژ پەیڤا توخم شرۆڤەکەین.

---

(٣) بنێڕە: محەمەد ئەمین هەورامی، فەرهەنگی ئێریەن ڤاچ، بەغدا، ١٩٨٧.

(٤) قانوونا گریم (١٧٨٥–١٨٦٣ز): هەڤبەندی لناڤ وەرارا کۆنسونانتێن زمانێن هند ـ ئەوروپی لاتینی ـ گریکی و سانسکریتی هەیە ئو دبێژتێ: قانوونا وەرگوهەڕینا کۆنسونانتان کو پاشی ب قانوونا گریم هاتیە ناڤکرن. بنێڕە: د. میشال زکریا، السنة المباديء والاعلام، ط٢، ١٩٨٣، بیروت. (ل١١٢).

هەروەسا دبێژنێ ئێکەمین ڤاڕێبوونا کۆنسونانتێن جەرمانی، کو بێپێژنێن پەقندە p,t,k ل زمانێ لاتینی ڤاڕێبووینە خشندەیێن جەرمانی f,e,x or ç. بنێڕە:

Stuart C. Poole, An Introduction to Linguistics, new york, 1999, p146.

| پەیڤێن کەڤنە زمانێن ئاری و هند - ئەورۆپی | پەیڤێن کوردییا ئیرۆ | | |
|---|---|---|---|
| | راست وەرگوهەزین | ڤاڕێبوون بۆ/ب/ | ڤاڕیبوون بۆ /گ/ |
| ڤەچ<br>ڤاچ<br>ڤاچەك (پەهلەڤی)<br>ڤاك (سانسکریت)<br>Vox(لاتینی) | وتن<br>واتە<br>وێژە<br>واژە | بێژ۔<br>(ببێژە،دبێژت،<br>دێ بێژت)<br>بانگ | گۆتن<br>گازی |
| ڤەرکە | ڤەرگ (زازاکی) | – | گور، گورگ |
| ڤیمەنە | – | – | گومان |
| ڤیسپە | – | – | گشت |
| ڤوهۆنی | – | (خوون، خوین) | گوون<br>(زازاکی)[٥] |
| ڤەهیشتە | – | بەهشت | – |
| ڤیست | – | بسك | (گێسو) |
| ڤەیری | – | (بیر؟) | گەڕ، گۆل |
| (ڤەخش؟) | ڤەحش | بەش | گەش |
| ئوشی (ڤوش) | پرتا دو ژ ناڤێ<br>(کەرووشك/کێرووشك/<br>کێڤریشك...) | بهیستن<br>(بهیس ـ تن) | گوهـ، گوچك |
| (ڤەلگ/ ڤەرگ) | – | بەلگ | گەلا، گەلگەلە |
| مات (سۆمەری)<br>ڤات، ڤێت<br>(هەخامەنشی)<br>ڤاهـ ، ڤێهـ (پەهلەڤی)<br>ماهـ (ئەرەبی ـ ماه الکوفه)[٦] | – | پێشگرێن<br>(با ــ، بێـ)<br>ل پێشییا ناڤێن<br>گوند و باژێڕان. | ـ گەهـ<br>جی<br>جهـ<br>جێ |

[٥] I ranian languages, wikipedia, website; www.wikipedia. cm

[٦] ئەڤ پەیڤنە ژ ئەڤان ژێدەران هاتینە وەرگرتن و ب پڕانی ئاڤێستاییینە:

ـ محەمەد ئەمین هەورامی، فەرهەنگی ئێریەن ڤاچ، بەغدا، ١٩٨٧.

ـ کۆڤارا کۆڕی زانیاری کورد، القسم العربي، توفیق وهبي، اصل الاکراد و لغتهم، بەغدا، بەرگ ٢، بەش ٢ ١٩٧٤.

_MerriamWebster's collegiate dictionary, ١٢h ed., USA, ٢٠٠٤

هەکەر ئەم ب هووری ل ئەڤی نەخشەی بنێرپن دو تشتێن هەڤدژ ب سانەهی دێ ئێنە دیتن: گوهەڕینەکا گشتی دگەل خوەپاراستنێ ل هەمان زمانی یان زاری. بۆ نموونه پەیڤێن (ڤەحش ـ بەش ـ گەش) پێکڤە د کرمانجییا ژۆریدا دهێنە دیتن! !

ـ دەڤێ خوە ڤەحش کر.

ـ دەڤێ خوە بەش کر.

ـ پشکۆژ گەش بوو.

د ئەڤان هەڤۆکاندا، هەرسێ پەیڤ (دگەل ڤارێبوونەکا تایبەت بۆ گەش) ئیرۆ ب هەمان مانایێ (ڤەبووی یان ڤەکری) د زارەکێ کوردیدا (کرمانجییا ژۆری) بکار دهێن! لێ پێدڤیە ئەڤە راستییەکا دی ژبیرا مە نەبەت کو زازاکی و هەورامییێ پتر ژ کرمانجییێ فۆرمێ دێرین پاراستیە.

ژ ئالیەک دیڤە، نموونە ئێك باندۆرا زارەکێ زمانێ کوردی لسەر یێ دی دیار دکەت. زازاکی و هەورامییێ پتر ژ کرمانجی فۆرمێ دێرین پاراستیە لەو، بێدودلی، هەبوونا وتن، واتە، وێژە و واژە د زارێن ژێرییا رۆژهەلاتی و ژێر زارێ سلێمانییێ دا ڤەدگەڕتە بۆ باندۆرا زارێ گۆرانی (هەورامییێ) لسەر کرمانجی.

هەمان دیاردە د پەیڤا (گوهـ)دا دهێتە دیتن. د ناڤێ لێکدایدا (کێرووشك، کەرڤۆشك، کێڤریشك، کەروێشك، ئو کەرگوشك) هێشتا فۆرمێ ئاڤێستایی دهێتە دیتن. لێ ڤارێبوونا بئی بهیستن ژێ پەیداکریە و یا گئی گوهـ و گوچك و جوێ (جێ) و گۆشا فارسی.

ل وەختێ د کوردیدا بسك دهێتە دیتن، د فارسیدا پتر گیسۆ دهێتە دیتن، هەکەرچی ـ نەدوورە ـ د کوردیدا هەمان فۆرمێ گئی بهێتە دیتن. چاوا بت،

هەکەر ئەم سەرڤەسەرڤە ل مژاریٚ بنێڕین کوردی پتر ڤاڕێبوونا بئیٚ تێدایە و فارسی پتر ڤاڕێبوون بەر ب گئیٚ تێدایە، لیٚ راستی وەسا نینە. د هەردوو زماناندا هەردوو ڤاڕێبوون دهێنە دیتن و هەردوو زمان پتر وەکو کۆمبەندەکا زاران دهێنە پێشچاڤ ژ زمانەکیٚ ڤەدەر وەرار کری.

بێگومان ئەڤ پاراستنا پتر ژ فۆرمەکیٚ مێژوویی، ئانکو دۆماندنا دوو سیٚ مێژوویێن جودا ڤەدگەڕتە چەند ئەگەران، دبت ئێك یان هەمی دروست بن: ئێك، جوگرافیا کوردستانیٚ کۆمەلێن ڤەدەر چێکرینە و پاراستینە، ئەڤان کۆمان وەرارا سەربخوە (ژبەر نەبوون یان لاوازییا هەڤبەندیان) کریە. ب گۆتنەك دی، هەر کۆمەکیٚ ل ژینگەهـ و جوگرافیایەکا جودا گوهەڕینێن جودا بسەر دا هاتینە. دوو، پێشداچۆنا جڤاکی و هەڤبەندیان ڤاڕێبوونا دوسەری (فۆرم و مانا) پەیداکریە، لەو هەردوو فۆرم (ییٚ کەڤن و ییٚ نوو) پارستی ماینە. سیٚ، دبت مشختبوونیٚ، چ ناڤخوەیی یان دەرڤەیی، فۆرمێن جودا ئینابنە دەڤەریٚ یان پەیداکربن و تێکەلبوونیٚ هەمی فۆرم پاراستبن. چار، دێرینییا خەلك و زمانیٚ کوردی لسەرێك کۆمبوونا فۆرمێن کەڤن و نوو پێکڤە هێلاینە.

چاوا بت، ئەڤا هاتیە پێشچاڤکرن، راستییەکا زمانیٚ کوردییە و تشتەکیٚ ئەنتیکە ژی نینە، لیٚ پتر ل زمانێن خودان کولتۆرەکیٚ درێژیٚ نڤیسای روو ددەت ژ زمانەکیٚ دێرینیٚ زاردەڤ هاتبتە ڤەگوهاستن. بۆ نموونە هەمان دیاردە د زمانیٚ ئینگلیزیدا دهێتە دیتن، هەکەرچی ژێدەریٚ هەردوو فۆرمان پچەکیٚ جودایە:

| نموونەیێن زمانێ ئنگلیزی | |
| --- | --- |
| فۆرمێ W یی | فۆرمێ G یی |
| Warrant | Guaranty |
| Ward | Guard |
| Wit | Guide |
| Win | Gain |

تشتێ بالكێش ل ئەڤی نەخشەی دوو - ژێدەریا ئەڤان پەیڤانە، فۆرمێ W یی ژ كەڤنە جەرمانییا بالا بۆ ئنگلیزیێ مایە كو رەها زمانێ ئنگلیزیە، و فۆرمێ G یی ژ باندۆرا زمانێ فرەنسی كو ژ زمانێ لاتینی وەرار كریە ناڤ زمانێ ئنگلیزی پەیدابوویە. ب گۆتنەك دی، فۆرمێ W یی رەسەنە و فۆرمێ G یی ژ باندۆرا زمانەكێ دی پەیدابوویە... لێ پرسیارا هەری گرنگ دێ مینت: هەردوو ژ چی پەیدابووینە؟ بۆ بەرسڤێ پێدڤیە ئەم گاڤەكێ پاشتر بچینە ئاستێ زمانێن كەڤنتر دا راستی بهێتە دیتن.

لێ ژبەر هەر ئەگەرا هەبت، مخابن، هند ب سانەهی نینە ئەم ژێدەرێ ئەوێ هەمەرەنگییا زمانێ كوردی بزانین یان كانێ لبەر باندۆرا چ زمان یان زار ئەڤ گوهەڕینە پەیدابووینە، چونكی مە نەشیایە خەتا وەرارا زمانێ كوردی لسەر مێژوویێ دیار بكەین. هەلبەت ئەڤە كارەكێ گەلەك گران نینە هەكەر ئەم بزانین دۆكیۆمەنتێن سێ هەزار سالی ل كوردستانێ هەنە ئەم دكارین ل پاشەرۆژێ مێژووا زمانێ خوە پێ بنڤیسین.

## ئەنجام

هەکەرچی کەرستەییٚ خام (پەیڤێن دێرین و یێن زارێن زمانیٚ کوردی) کێم د ئەڤیٚ لێکۆلینیٚدا بکار هاتینە لیٚ تێرا هندیٚ دکەن کو دیتنەکیٚیان بۆچۆنەکیٚ بۆ مە ل دۆر هەڤبەندی و وەرارا زمانیٚ کوردی دروست بکەت:

١ـ ڤارێبوونا دەنگیٚ /ڤ/ deviation ل پێشییا پەیڤان د زمانیٚ کوردیدا کۆك و ئێك ـ تەرز نەبوویە.

٢ـ ب کێماتی سیٚ فۆرم د کوردییا ئیرۆدا دهێنە دیتن: فۆرمیٚ کەڤن، ڤارێبوون بۆ /ب/ و ڤارێبوون بۆ /گ/.

٣ـ ڤارپیبوونا دەنگی /ڤ/ ل پێشییا پەیڤان، پتر لە زاریٚ کرمانجی (کرمانجی و سۆرانی) روودایە.

٤ـ ڤارپیبوونا فۆرمیٚ پەیڤیٚ ڤارێبوونا مانایێ ژی ب خوەڕا ئینایە.

٥ـ هەمان دیاردە د زمانێن دیدا، وەکو فارسی و ئنگلیزی، دهێتە دیتن.

٦ـ ئەگەرێن پەیدابوونا ئەڤیٚ دیاردەییٚ د زمانیٚ کوردیدا ب دۆکیۆمەنتێن مێژوویی و زمانڤانی، نەهاتینە پەسەند کرن.

## ژێدەرێن وەج ژێ هاتیە وەرگرتن

١- کۆڤارا کۆڕی زانیاری کورد، القسم العربي، توفیق وهبي، اصل الاکراد ولغتهم، بەغدا، بەرگ ٢، بەش ٢، ١٩٧٤.

٢- مەکێنزی (وەرگێڕ: نەوزاد هرۆری)، کۆکا زمانێ کوردی، سایتێ نەفەل، ٢٠٠٦.

٣- د. جەمال ڕەشید، دراسات کردیة في بلاد سوبارتو، بغداد، ١٩٤٨.

٤- محەمەد ئەمین هەورامی، فەرهەنگی ئێریەن ڤاچ، بەغدا، ١٩٨٧.

٥- سۆکۆلۆڤ، زمانی ئاڤێستا، بەغدا، ١٩٨٨. (وەرگێڕ: محەمەد ئەمین هەورامانی).

٦- د. میشال زکریا، السنیة المبادیء و الاعلام، ط٢، ١٩٨٣، بیروت.

٧- Merrian-Webster's collegiate dictionary, 12th ed., USA, 2004.

٨- Stuart C. Poole, An Introduction to Linguistics, New York, 1999.

٩- Joseph H. Peterson, Dictionary of most common AVESTA words, 1995, www,avesta.org.

١٠- www.wikipedia.com, Iranian languages.

# ملخص البحث

## تغير صوت /ڤ/ في بداية كلمات اللغة الكردية

**د. فاضل عمر**

هذه الدراسة تحاول الوقوف على تطور او انحراف الصوت /ڤ v/ في بداية كلمات اللغات هند ـ ايرانية القديمة في اللغة الكردية الحديثة الى الصوت /ب b/ او الصوت /گ g/ او الاحتفاظ بصيغتها القديمة. وتحاول ـ رغم قلة المادة الخام ـ ان تستنتج ان هذا الانحراف الصوتي ولعدة اسباب لم يكن منتظما.

من النظرة العامة يمكن الاستنتاج ان اللهجات الكردية سلكت مسالك متنوعة في هذا الاتجاه، بعضها حافظت على الصوت القديم بصوتها الاولية او حولتها الى /و/ والبعض الآخر حرفتها باتجاه الصوت /ب b/ او /گ g/.

في المحصلة ورغم حدوث هذه التغيرات الصوتية فانه لايمكن الاعتماد عليها لفرز اللهجات الكردية رغم احتفاظ اللهجة الگورانية بالصوت القديم اكثر من الكرمانجية.

## Abstract

### Deviation of /v/ phoneme at the Beginning of Kurdish words

Fadil Umer

This article is an attempt to trace the change or deviation of /v/ phoneme in the beginning of ancient Persian and occasionally remained unchanged especially in Gorani dialect of Kurdish language.

From the preliminary glance to the Kurdish dialects we can detect different pr all deviations within one dialect apart of Gorani which generally had preserved the ancient form.

In conclusion, we can’t depend on this phenomenon alone to differentiate or divide the Kurdish dialects although Gorani generally had preserved the ancient forms better than other dialects and languages.

# سەرەتایەك بۆ ناسینەوەی عەلی حەریری

**بەدران ئەحمەد حەبیب**

یەكێك لە كێشەكانی نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی كوردی، كێشەی كەمی یان نەبوونی زانیاریی راست و بەڵگەدارە. كەسێك بیەوێ لەبارەی شاعیر یان رووناكبیرێكی بۆ نموونە سەدەی نۆزدەیەمەوە بنووسێ، كە سەدەیەكی نێزیكە لێمان، كەمترین زانیاریی لەبارەی ژیان و ژینگەی ئەو شاعیر یان رووناكبیرەوە دەست ناكەوێ [1]. ئەمەش زۆر هۆی هەیە، لەوانە: دەستنووسی زانا و ڕۆشنبیرانی كورد بۆ ماوەیەكی زۆر نەپارێزراون، دەستنووسی كوردی زۆربەیان دوای ماوەیەك لە مردنی دانەریان، سەبارەت بە دواكەوتوویی و نەخوێندەواریی كۆمەڵگەوە نرخیان نەزانراوە و فەوتاون. هەروەها كەمیی بنكەی زانیاری لە كوردستان لە لایەك و بەردەوامبوونی ناجێگیریی سیاسی لە لایەكی ترەوە، هۆی تر بوونە لەوەی زۆربەی بەڵگە و دەستنووسە كوردییەكان بفەوتێن، یان بەملا و بەولادا بڵاو ببنەوە و جارێكی تر نەكەونەوە دەست.

---

(١) لەمبارەیەوە سەیری سێ بەرگی كتێبی حاجی قادری كۆیی بكە لە دانانی مەسعوود محەمەد و ببینە نووسەر لە ئەنجامی نەبوونی زانیارییەوە بە چ چنگەڕنێیەك هەوڵ دەدا لە هەورازی ناسینەوەی ژیانی حاجی و كێشەكانی ئەو دەمی كۆمەڵگەی كوردەوارییەوە سەر بكەوێ، زۆر جاریش بەدەستی خاڵی لێی دەچێتە دەر.

جگە لەمانە، تا ئێستا لەلای لێکۆڵەوانی خۆماڵیدا تاك و تەرا جارێك نەبێ، نەبووە بە باو کەوا خوێندنەوەی ورد و توێژینەوەی زانستییانەی دەق، بکرێ بەبنەوێ بۆ ناسینەوەی ئەو چاخەی نووسەرێك یان ئەدیبێکی تێدا ژیاوە، ئەمەش بەر لە هەر شتی تر لە ئەنجامی کەمیی پسپۆڕییەوە دێت. دەقی نووسین باشترین بەڵگەیە بۆ ناسینی کەسایەتیی نووسەر یان ناسینەوەی ئەو چاخەی تێیدا ژیاوە. بۆ نموونە تا ئەم ساڵانەی دوایی وا باو بوو، بابایەکی وەك نالی لە ساڵی ١٨٥٦دا کۆچی دوایی کردووە، مێژووی لە دایکبوونیشی بەساڵی ١٨٠٠ دەست نیشان کرابوو، ئەگەر وابێ دەبێ ئەم پیاوە تەنیا ٥٦ساڵ ژیابێ لە کاتێکدا چەندین شیعر لە دیوانی ئەودا هەن ئاماژە بەتەمەنێکی زیاتر لە حەفتا ساڵی دەکەن. تا خۆشبەختانە لەم ماوانەی دواییدا، بەپێی کتێبێکی چاپکراوی سەردەمی عوسمانییەوە دەرکەوت نالی تا ساڵی ١٨٧٣ لە ژیاندا بووە[٢].

باشە ئەگەر حاڵی نالی و حاجی وا بێ، کە هەردووکیان لە سەدەی نۆزدەیەمدا ژیاون، دەبێ حاڵی ڕووناکبیرانی سەدەکانی پێشوو بۆ نموونە عەلی حەریری چۆن بێ، کە چەندان سەدە بەر لەوان ژیاوە! ئەوەتا یەکێك

(٢) ناوی ئەم کتێبە: ئۆسمانی مووەلیفەری–یە، دانانی: بورسالی محەمەد تاهیر ئەفەندی. دانەر ساڵی ١٨٦١ لەشاری بووسە لە دایك بووە و ساڵی ١٩٢٤ لە ئەستەنبۆڵ مردووە. کتێبەکە ساڵی ١٩٠٥ بۆ جاری یەکەم چاپ کراوە و ساڵی ١٩٧٢ بۆ جاری دووەم لە ئەستەنبۆڵ بەپیتی لاتینی چاپ کراوەتەوە. دانەر باسی گەلێك لە شاعیر و ڕۆشنبیرانی کوردی کردووە، بۆ نموونە لە لاپەڕە ٢٨٤ی بەرگی دووەمدا، لە بارەی نالییەوە دەڵێ: ساڵی ١٨٧٣ لە ئەستەنبۆڵ مردووە و لە گۆڕستانی قەرەجە ئەحمەد نێژراوە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: کۆڕاوی وان، ژمارە: ٢ ساڵی ١٩٩٢ وتارێك لەلایەن مەحموود لەوەندییەوە لەبارەی نالی لەو کتێبەدا.

دەڵێ عەلی حەریری لە سەدەی یازدەیەمدا ژیاوە، ئەوی تر دەڵێ نەخێر سەدەی پازدەیەم، سێیەم دەڵێ نەخێر سەدەی شازدەیەم، یەکێك دەڵێ خەڵکی هەکارییە، دووەم دەڵێ نەخێر هەریرییە! یەکێك دەڵی گۆڕەکەی لە شارۆکەی هەریری باکوری ڕۆهەڵاتی هەولێرە، دووەم دەڵێ نەخێر دەبێ لە شام مردبێ! هەشە گوتوویەتی عەلی حەریری هەر نەبووە.

هەڵبەت من پسپۆڕ و لێکۆڵەوەی ئەدەبی کوردی نیم تا لاف شارەزایی لێ بدەم، بەڵام وەك خوێنەرێکی ئەدەبی کۆن و ئارەزوومەندێکی ناسینی رابردووی میللەتەکەم، وەك زۆر کەسی تر بەردەوام بەرئەنجامی رامان و تاوتوێ کردنم لەلا دروست دەبێ و ناشیاننووسمەوە، بەڵام ئەمجارەیان هەولّم دا بۆچوون و بیرکردنەوەی خۆم لەبارەی عەلی حەریرییەوە بەفیڕۆ نەدەم و پێشکێشی خوێنەرانی بکەم، لەوانەیە سوودێکی ببێ. واش دەزانم کەوا ئەم شاعیرە لە هەموو شاعیرانی کۆنی کوردی زیاتر پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ورد و بیندرێژ هەیە.

راستت دەوێ، کێشەی عەلی حەریری کێشەیەکی گەورەیە، جگە لە کەمیی زانیاری لەبارەی ژیانی خۆیەوە، تا ئێستە ژمارەیەکی کەمیش لە بەرهەمەکانی گەیشتوونەتە دەستمان و بەشی لێکۆڵینەوەی تێر و تەژی ناکەن. دەبێ لەم هەلەدا دەسخۆشی لە بەڕێزان عەبدوڕەقیب یوسف و محەمەد عەلی قەرەداغی بکرێ، کە هەر یەکە و چەند شیعرێکی ئەم پیاوەیان دۆزیوەتەوە، بەمەش سەرەداوێکیان داوەتە دەستی لێکۆڵەوان بۆ گەیشتن بە هەندێك راستی لەبارەی هزر و ژیان و سەردەمی ژیانیەوە.

لەبارەی کەمیی بەرهەمی عەلی حەریرییەوە، زەینی مرۆڤی ئاسایی بۆ تاکە هۆیەك دەڕوات ئەویش دووریی ئەو سەردەمەیە کە تێیدا ژیاوە، سەدەی

ئەسـیری میحنــەتی هیجرانــی تــۆم، یــاری وەفاکــارم
کوژراوی خەنجەری موژگـانی تـۆم، مـەحبووبی نـازدارم
عیلاجـــێکم بکـــە دەردم گرانـــە، قیبلەکـــەی دیـــنم
بکــە ڕەحمــێ بەفرمێـسکی دڵـۆپی چـاوی خــەمبارم
فیدای لـەعلی لـەبت بم، بێنـە یـادت شـەرتەکەی جـاران
نەوەك عـومرم بـەناکامی بـڕوا [٩] غـولامێکی ئەمەگدارم
مـەلا و زاهیـد و سـۆفی، غـەریقی بـەحری عیـشقی تـۆن
بزانــە مــن لــە ئــەم حاڵــە، چ ئوسـتادێکی هۆشـیارم
نەخۆشــێکم بــەبێ دیــداری تــۆ، یــار شــیفا نــابێ
مەگــەر عیـسای مریــەم بــێ، بکـا دەرمــانی ئــازارم
عــەلی هــەتاوەکو دەمــرێ ئینتیــزاری قامــەتی یــارە
لە نێو عیشقت قوتار نابێ هـەتا خـۆی بـێ بەغـەمخوارم

لە "پاشکۆی عێراق"یشدا دەقێکی تر هەیە مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی بڵاوی کردووەتەوە، بەڵام دەقەکە دوور و درێژە، وا لێرەدا چەند کۆپلەیەکی کەمی لێ وەردەگرین:

چەند شەوان مەجنوون و مەستم، شـیبهەتی پەروانەیـە
دائیما مـەی هـەر بەدەسـتم، چـون کـچی بـاغی خوەیـە
چون کچن چەنگاڵ بەدەستن، بولبولان سەرخۆش و مەستن
هیندییان میصری بەدەسـتن، ژیـن لـە مـن بـێ فایدەیـە

(٩) ئەم وشەیە (بڕوا) شوێنەکەی چۆڵ بوو، من دامناوە.

تاڵ دەبوون وەقت و زەمانـە، سـوورگوڵان پـەرژین رەحانـە
هــەر کەســێ بــێن کــا ئەوانــە، ســـەرخۆش و دێوانەیــە

تا لە کۆتاییدا :

ئــەی حــەریری هــەر دەبێــژی، عاشــقی ســەودا و گێــژی
بــێ بــرین خــوێنێ دەرێــژی، هــەر شــەوە تــا ســوبحەیە

ئەم شیعرانە هەموو نیشانەی ئەوەن، کە جیاوازییەکی زۆر لە نێوانی عەلی عاشق و عەلی حەریریدا هەیە. وەك لەم شیعرەی دواییدا دەردەکەوێ، رەنگە ئەم عەلییەش جاربەجار نازناوی حەریریی لە پاڵ عاشقدا بەکار هێنابێ لەبەرئەوەی ئەویش لە حەریردا ژیاوە و شانازیی بەم هەوارگەیەوە کردووە. دەبێ ئەوەش بڵێین، لەبەرئەوەی ئەم شیعرانەی عەلی عاشق دەماودەم پارێزراون و کەم نووسراونەتەوە، رەنگە بەر دەسکاری کەوتبن و بۆیان زیاد و کەم و کرابێ، یان شێوەی زمانەکەیان گۆڕابێ، بۆیە لە رووی زمان و دەقەوە زۆر جێی متمانە نین.

لە کۆتاییدا، دەمەوێ تێبینییەکی تریش لە بارەی شیعری پەریزادێوە بڵێم، ئەویش ئەوەیە: دەقێکی تری ئەم شیعرە هەیە کە بەکرمانجیی سەروو نووسراوەتەوە. ئەم دەقەی دوایی، ئاڵۆزیی نێوان عەلی حەریری و عەلی عاشقی زیاتر کردووە. وەك بینیمان دەقە موکریانییەکە دراوەتە پاڵ عەلی عاشق، بەڵام کرمانجییەکە دراوەتە پاڵ عەلی حەریری.

هەروەك پێشتر ئاماژەم بۆ کرد، شیعری عەلی حەریری ئەگەر نووسەرەوەکەی خەڵکی بەری ڕۆهەڵاتی زێی بادینان بووبێ کاریگەریی

دیالەکتی کرمانجیی خوارووی چووەتە سەر، بەڵام ئەگەر لە بەری ڕۆژئاوا بووبێ ئەوا کاریگەریی شێوەزاری بادینانیی خراوەتە سەر. بۆ بەڵگەی ئەمەی دوایی، خوێنەر دەتوانێ سەیری ئەو دەقانە بکات کە سادق بەهائەدین ئامێدی لە کتێبی هۆزانڤانێت کورددا پێشکێشی کردوون و بەراوردیان بکات لەگەڵ دەقەکانی تردا. سەرنج ڕاکێش ئەوەیە شیعری: پەریزادێ بەخێر هاتیی عەلی عاشقیش بەدەردی شیعرەکانی عەلی حەریری چووە و بگرە زیاتریش. وەك گوتمان لەبەرئەوەی عەلی عاشق و عەلی حەریری بەیەك کراون لە دەستنووسە کۆنەکاندا، هەندێك نووسەرەوەی بەری بادینان هەڵساون بەگۆڕینی دەقەکە لە موکریانییەوە بۆ بادینی.

ئەگەر مرۆڤ سەیری ئەو چەند شیعرەی عەلی حەریری بکات کە نووسیمانەوە، دەبینێ لە رووی زمان و داڕشتنەوە چەند جیاوازن لە شیعری پەریزادێ. عەلی عاشق وەك گوتمان فەقێ بووە و شیعرەکانی کەمتر جێ پەنجەی ڕۆشنبیرییەکی هەڵکشاویان بەسەرەوەیە، زیاتری وشەکانی خۆماڵیی ناوچەی موکریان و هەریرن و لە کوردیی پەتیی بەیتی شایەران دەچن، کە کتێبی توحفە موزەفەرییە پڕە لە نموونەی ئەمانە.

ئەمە شێوەی دەقە بادینییەکەیە، کە لە کتێبی هۆزانڤانێت کوردەوەم ڕاگواستووە:

**پــــــــەریزادە تــــــــــو وا هــــــــــاتی**
**لــــــسەر چـــــــافێن دمــــــــن شـــــــالا**
**مــــــە لــــــەو زانـــــــی تــــــو وا هـــــاتی**
**ژ دەنگــــــــــێ تـــــــــەوق و خرخــــــــالا**

ژ دەنگێ بازن و زەندا
نەما عەقلێ عەقلەمەندا
هندی من گۆت سی و چەندا
تۆ چێتر بوی ژ هەڤالا

تۆ چێتر بوی ژ لەیلایێ
شرینتر بووی ژ زولەیخایێ
مەم و زین هەر دو یەك تایێ
سیا زولفێ كرم تالا

سیا زولفێ تو ناترسی
ژ ئەحوالێ مە ناپرسی
مبارك بیت تە ئەو كورسی
تو روینێ گوه بده عەبدالا

تو روینێ گوه بده بەیتێ
لپێشی تو وەكی زەیتێ
د سۆژیت مەجلسا مەی تێ
وەكی پویشێ لكەندالا

وەكی تە ڤنووس بێ پەروانم
دخۆم سوندێ جودا نابم
حەزینم ئەز قەت تێر نابم
ژ دیدارا خەت و خالا

لدیـــــدارا تـــــه ئـــــەز زینکـــــەم
حـــــەتا کـــــەنگیٚ روح تـــیٚ تەنکـــــەم
کەســـــەر بـــوم جـــارەکیٚ بـــین کـــەم
خودانـــــا تیـــــت و دەســـــــتمالا

خودانـــــا تیـــــت و جەبهـــــەت بــــی
خـــــەراج و ئـــــەرد و قیمـــــەت بــــی
دیـــــدارا تـــــه بقیمـــــەت بــــی
لعیـــــد و جـــــەژن و سەرســـــالا

ئـــــەول کـــــار و کەســـیٚ مـــن تـــوی
یـــــەقین فرنـــا دەرســـیٚ مـــن تـــوی
کەســـیٚ مـــن و بەســـیٚ مـــن تـــوی
لزێـــــر و مـــــال و پـــــر نـــــالا

لزێـــــر و مـــــال و پـــــڕ رەنجـــــم
کەســـــادم صـــــاحبم گـــــەنجم
لبـــــاژێرا گەوهـــــەر سەنـــــچم
ســـــەفەر دویـــــره هـــــەتا مـــــالا

ســـــەفەر دووره شـــــەبیٚ تـــــاری
ئـــــەی عـــــەلی و تـــــو پـــــڕ رایـــــی
دابکـــــەین زیکـــــریٚ جـــــەباری
بـــــەلکی لمـــــه خوشـــــبت شـــــالا

له كۆتاييدا، هيوادارم بەم نووسينه توانيبێتم چينێكم له چينگەلی فره و ئەستووری دەوراندەوری عەلی حەریری رەواندبێتەوه و خزمەتێكم پێشكێش كردبیٚ.

## سەرچاوە:


(١) اربيل في أدوارها التاريخية، زبير بلال اسماعيل، بغداد، ١٩٧١.

(٢) کۆواری زاری کرمانجی، مێژووی میرانی سۆران، حوسێن حوزنی موکریانی، رەواندز ١٩٢٧ ـ ١٩٣٢.

(٣) دیوانا کرمانجی، بەرهەڤ هینانا: عەبدوڕەقیب یووسف. نەجەف، ١٩٧١.

(٤) بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە رێگەی دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی دووەم، دانراوی: محەمەد عەلی قەرداغی، بەغدا ١٩٩٩.

(٥) بووژاندنەوەی مێژووی زنایانی کورد لە رێگەی دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی سێیەم، دانراوی: محەمەد عەلی قەرداغی، بەغدا ٢٠٠٠.

(٦) مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سەجادی، بەغدا ١٩٧١.

(٧) مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی دووەم، د. مارف خەزنەدار، هەولێر ٢٠٠٢.

(٨) هۆزانڤانێت کورد، دانان و تویژاندنا: سادق بەهائەدین ئامێدی. بەغدا ١٩٨٠.

(٩) نورالدين عبدالرحمن جامی، علی أصغر حکمت، ١٣٦٣ تهران.

(١٠) دەفتەری کوردەواری، بەرگی یەکەم، بەغدا ١٩٧٠ وتارێك بەناونیشانی: عەلی هەریری، د. عیزەدین مستەفا.

(١١) دەفتەری کوردەواری، بەرگی سێیەم، بەغدا ١٩٧٠ وتارێك بەناونیشانی: هۆزانڤانێ کلاسیکیێ بناڤ و دەنگ عەلی حەریری، سادق بەهائەدین ئامێدی.

(١٢) پاشکۆی ڕۆژنامەی عێراق، ژمارە ٣٧ حوزەیران و تەمووزی ١٩٨٠ وتارێك بەناونیشانی: لەبارەی سەرگوزەشتی عەلی عاشقەوە، محەمەد قادر ئەحمەد (کزەڵ).

(١٣) کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم، محەمەد عەلی قەرەداغی. بەغدا، ١٩٨٠.

(١٤) پاشکۆی ڕۆژنامەی عێراق، ژمارە ٣٤ شوباتی ١٩٨٠ وتارێك بەناونیشانی: عەلی عاشق و عەلی حەریری و ئاسۆیەکی ڕووناکتر، محەمەد عەلی قەرەداغی.

(١٥) گۆواری ڕووناکی، ژمارە ٨ ساڵی ١٩٣٦ هەولێر، بابەتێك بەناونیشانی: عەلی بەردەشانی شایەری کورد.

(١٦) الجامع في تاريخ الادب العربي، الجزء الاول، حنا الفاخوري.

(١٧) شەرەفنامە. وەرگێڕانی هەژار.

(١٨) خانزاد و لەشکری. محەمەد تۆفیق وردی. بەغدا ١٩٦٠ .

(١٩) گۆواری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد. بەرگی ١٨ و ١٩. ساڵی ١٩٨٨ بەغدا، بەیتی لاس و خەزاڵ، بەشی یەکەم.

(٢٠) گۆواری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد. بەرگی ٢٠. ساڵی ١٩٨٩ بەغدا، بەیتی لاس و خەزاڵ، بەشی دووەم.

# ملخص البحث

## مقدمة للتعرف على الشاعر علي حريري

**بدران أحمد حبيب**

يعد علي حريري أحد الشعراء الكلاسيكيين الكُرد وقد كتب أشعاره باللهجة الكرمانجية الشمالية، إلا أن عدد ما وقع تحت اليد من أشعاره قليل. كما ان المعلومات المتواترة عن محل ولادته وحياته لا يُعتد بها. يورد الباحثون في الأدب الكُردي معلومات متناقضة عن علي الحريري. فبعضهم يقول بانه عاش في القرن الحادي عشر والبعض الآخر يقول بأنه عاش في القرن الخامس عشر وآخرون يقولون في القرن السادس عشر. اما فيما يتعلق بمحل ولادته و إقامته فتتضارب المعلومات مرة أخرى، ففيما يذهب بعض المؤرخين الى أنه من أهالي قرية حرير في منطقة هكاري، يميل البعض الآخر الى نسبته الى مدينة حرير التي تقع في شمال شرق أربيل.

القائم على هذا البحث، و إستناداً الى ما جمعه من أدلة ووثائق تاريخية، خرج بمعلومات جديدة عن محل ولادة و وفاة هذا الشاعر. و بحسب تلك الوثائق يتضح بأن علي حريري قد عاش في عهد الأمير شاه علي بك و إبنه الأمير سيد علي و كلاهما عاش و حكم للفترة الممتدة من النصف الثاني من القرن الخامس و حتى نهاية الربع الأول من القرن السادس عشر. وهذا دليل على النهضة الأدبية التي شهدتها فترة حكم أمراء سوران. وقد شبّه الشاعر حجي قادر كويي في احد قصائده على حريري بحسان بن ثابت (المعروف في تاريخ الأدب العربي بشعر المديح الذي نظمه للأمراء و كبار رجال الدولة) الأدب الكُردي. و قد مدح علي حريري في إحدى قصائده الأمير سيد علي واصفاً إياه بالأمير الشجاع الكريم و المقاتل الباسل.

# Abstract

## ABOUT ALI HARIRI

**Bedran Ahmed Habeeb**

He is one the Classic Kurdish poets. He wrote his poems with “Kurmanji” dialect of Kurdish language, and till now only few of his poems are known. There is no eligible information about his life or his place of birth. Historian of Kurdish Literature wrote conflicting biographies about Ali Hariri, some say he is a poet from 11th century others say he is a 15th century poet and some say he is a poet from the 16th century. Similarly, information about his place birth and where did he lived are also controversial, some say he is from Harir village in Hakari district in Turkish Kurdistan, others say he was born in Harir sub-district north east of Erbil.

This research, according to gathered evidence and historical documents, sheds some light on place of birth, life and death of this poet. Accordingly, poet Ali Hariri lived in Shah Mir Ali Beg and his son Mir Sayed Ali reign-both rulers lived and ruled in the second half of the 15th century until the first quarter of the 16th century. This fact indicates the development of Kurdish literature under the Soran Emirs. Haji Qadir Koyee in one of his poems describes Ali Hariri as Hassan Bin Thabit (one of famous literary figures of the Arabic literature known for his poems that praise Emirs and leaders) of the Kurdish Literature. Ali Hariri praises Emir Sayed Ali in one of his poems as being a brave fighter and generous leader.

# سێ فەرهەنگی کوردی

"ئەوەی لەسەر لاپەڕەکانی ئەم کۆوارە بە زمانی کوردی بڵاو دەکرێتەوە لە بنجدا باسێك بوو لە ساڵی ١٩٦٤ لە کۆنفرانسێکی زمانەوانی لە بەشی کوردناسی لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیەی زانستی سانت پیترسبورگ (ئەوسا لینینگراد) بە زمانی ڕووسی پێشکێشم کرد . لەکاتی خۆیدا تەنیا ١٥٠ دانە لە نویشکی باسەکە چاپ کرا بۆ ئەو پسپۆڕانەی پێویستیان پێی هەبوو .

وام بە پێویست زانی باسەکە وەکو خۆی بەبێ دەسکاری وەربگێڕمە سەر زمانی کوردی و لەم کۆوارەدا بڵاوی بکەمەوە" .

**مارف خەزنەدار**

## پێشەکی

لەو ساڵانەی دواییدا سێ فەرهەنگی کوردی لە ئێران و عیراق بڵاوکرانەوە، دانەرەکانیان زانا و ڕۆشنبیری کوردی ئەو دوو وولاتە بوون . ئەم سێ کارە دەسکەوتێکی گرنگە لە مەیدانی ڕۆشنبیری کوردیدا چونکە لەم لایەنەوە سەرچاوەیێکی پێویست لەبەر دەست نەبوو بەشی هەموو ئەو کەسانە بکا کە خەریکی مەشقی نووسینی کوردی دەبن ، بێ گومان ئەو فەرهەنگانەی لە بابەت زمانی کوردییەوە لە سەدەی نۆزدەم و سەرەتای

سەدەی بیستەم لە ئەوروپا و کوردستان کەوتبوونە ناوەوە نووسەری کورد ئاگاداریان نەبوو .

نووسینێکی کورت لە بابەت ئەم سێ فەرهەنگەوە پلەی پێشکەوتنی زمانەوانیمان بۆ دیار دەکا لە کوردستان . لێرەدا مەبەسم ڕۆژگارانی پێش ساڵی ١٩٦١ـە ، بێ گومان ئەم فەرهەنگانەش پێش ئەو ساڵە ئامادەکراون بۆ چاپ . ساڵی ١٩٦١ سەرەتای شۆرشی ئەیلوولی ئەو ساڵە بوو لە کوردستانی عێراق ، واتە سێ ساڵ بەر لە ئێستا و تا ئەو ماوەیەی ئەم باسە پێشکێش دەکەم دەتوانم بڵێم بزووتنەوەی خوێندەواری و ڕۆشنبیری لە کوردستانی عێراق زۆر بێ هێز بووە یا وەستاوە .

## فەرهەنگی مەردۆخ (١٩٥٦)

فەرهەنگی مەردۆخ فەرهەنگێکی کوردی ـ فارسی ـ عەرەبی‌یە ، لە دانانی مێژوونووس و زمانەوانی کورد شێخ محەمەد مەردۆخی کوردستانی‌یە . لە ساڵی ١٩٥٦ لە چاپخانەی سوپا (آرتش) لە تاران چاپ کراوە . وەکو لە نزیکەکانی شێخی مەردۆخم بیستووە فەرهەنگەکە بە فەرمانی محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی لە چاپخانەی وەزارەتی بەرگری (آرتش)ی ئێران لە شاری تاران بە چاپ گەیەنراوە .

فەرهەنگی مەردۆخ لە دوو بەرگ پێك هاتووە ، بەرگی یەکەم (٩٨١) لاپەڕەیە، بەرگی دووەم (٩٦١) لاپەڕەیە، بە ڕێگەی زەنگوغراف چاپ کراوە ، واتە ناوەرۆکی تێکستەکان دانەر هەمووی بە دەستی خۆی نووسیوەتەوە و وەکو



# کتاب

# فرهنگ مردوخ

تألیف فاضل شهیر

حضرت آیت الله آقای شیخ محمد مردوخ کردستانی

**جلد اول**

چاپخانه ارتش

خۆی چاپ کراوە . بەم جۆرە ئەم بەرهەمە گرنگە خۆی وەکو دەسنووس دەنوێنیٚ، تەنیا ئەوە هەیە ژمارەییێکی زۆری لەبەر دەست دایە . بۆ بەکارهێنانی فەرهەنگەکە گیروگرفت لە ناوەوە هەیە ، بۆیە وەکو سەرچاوەییێکی گرنگ پێویستە حسێبی لەگەڵ دا بکریٚ و ببێتە کەرەستەییێك بگوێزرێتەوە سەر کارت (فیشە) بۆ ئامادەکردنی فەرهەنگی گشتی گەورەی زمانی کوردی .

لـە بەرگی یەکــەم دا دانـەر باس لە دیالێکتی بچووکی ناوچەی ئەردەڵان دەکا ــ یەکێکە لە دیالێکتە بچووکەکانی دیالێکتی کرمانجی باشوور ــ گرنگی ئەم دیالێکتە دەردەبڕیٚ و باس لەوە دەکا ئەلفوبیٚی زمانی عەرەبی بۆ نووسینی کوردی بەکاردەهێنریٚ و هەردووکیان لەگەڵ یەکتریدا گونجاون . ئینجا بە کورتی لە دەستووری زمانی کوردی دەدویٚ . باس لە بابەتەکانی "ناو ، سیفەت ، فیعل" دەکا (ل٨ ـ ١٩) ، ئەوجا باس لە دروست بوونی فیعل دەکا ، هەروەها بەڵگە بۆ گۆڕینی فیعل دێنێتەوە بەپیٚی دیالێکتە بچووکەکانی دیالێکتی کرمانجی باشوور . لە مەسدەری ((کردن)) نموونەی ((کرد ، کردووە ، کردگە ، کردوو ، ئەکرد ، ئەکا ، بکە)) دێنێتەوە .

ووشەکانی فەرهەنگەکەی لەسەر بنچینەی ئەلفوبیٚ داناوە و بەپیٚی ڕێز کردنی هیجا ((ئـ ، ب ، پ ، ت ، . . .)) کارەکەی گەیاندۆتە ئەنجام .

دانەر بۆ ئەوە نەچووە ووشەکان لێك بداتەوە ، ئاماژە بەوە بکا چەند مانایێك دەبەخشن ، هەروەها هەوڵی نەداوە گۆڕینی مانایان لەناو ڕستەدا ڕوون بکاتەوە .

جگە لەمانە کەموکووڕی دیکەش لەو فەرهەنگەدا بەرچاو دەکەوێ ، وەکو:

١ـ ئاوڕی لە ((ئەدات)) نەداوەتەوە ، ئەم لایەنە لە زمان دا گەلێ گرنگە چونکە لەلایێك مانای ووشە دەگۆڕن و لەلایێکی دیکەوە ووشەی تازە دروست دەکەن .

٢ـ لایەنی فۆنێتیك فەرامۆش کراوە چونکە ووشەکە ترانسکریپ نەکراوە ، بۆیە یەکێکی زۆر شارەزا نەبێ خوێندنەوەی ووشەکان بە ڕاستی و وەکو هەیە و پێویستە لە دەمی نایەتە دەرەوە .

٣ـ لە هەموو حاڵەتێکیش دا مانای ووشەی لێك نەداوەتەوە .

٤ـ بەڵگەی نەهێناوە بۆ بەکارهێنانی ووشەی هەموو فەرهەنگەکە ، ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی مانای ووشەکان بەڕاستی و تەواوی نەکەوێتە ڕوو .

ئەم کەموکووڕیانە لە نرخی فەرهەنگەکە کەم ناکەنەوە . ئەم بەرهەمە زانیاریییێکی زۆر بە کەڵکی تێدایە ، کەموکووڕیەکان دادەپۆشن . زانیاریە بە کەڵکەکانی ناو فەرهەنگەکە ئەوەیە کۆمەڵێك ووشەی ناو ماڵی کورد و زاراوەی کشتوکاڵ و ئاژەڵ و ژیانی گوندایەتی تێیدا تۆمار کراون بە تایبەتی ئەوەی پێوەندی بە ژیانی کوردەواری ناوچەکانی ئەردەلان و موکریانی کوردستانی ئێرانەوە هەیە . بەم جۆرە ئەم فەرهەنگە سەرچاوەییێکی گرنگە بۆ پیشان دانی خاسیەتی دیالێکتی بچووکی ئەردەلان و بەراوردکردن لەنێوان ئەم دیالێکتە و دیالێکتەکانی دیکەی زمانی کوردی ، بەم پێیە فەرهەنگی مەردۆخ سەرچاوەییێکی گرنگە بۆ نووسینەوەی فەرهەنگی گشتی زمانی کوردی .

# فەرهەنگی خاڵ (١٩٦٠)

فەرهەنگی خاڵ فەرهەنگێکی کوردیـیە لە دانانی ڕۆشنبیر و نووسەر و زمانزان و مێژوونووسی کورد شێخ محەمەدی خاڵ ، لە ساڵی ١٩٦٠ لە سلێمانی چاپ کراوە . ئەمە بەرگی یەکەمی فەرهەنگەکەیە . وەك دەردەکەوێ بە چەند بەرگێك کۆتایی پێ دێ . ئەم بەرگە یەکەمە لە (٣٨٠) لاپەڕە پێك هاتووە ، ووشەی دەنگەکانی «ئـ ، ب ، پ ، ت ، ج»ی گرتۆتە خۆ . هیوادارین بەم زووانە چاومان بە بەرگەکانی دیکەش شاد بێ[1] .

لە پێشەکی فەرهەنگەکە دانەر ئەوە دەنووسێ لە ساڵی ١٩٣٦ەوە خەریکی دانانی فەرهەنگێکی گەورەی گشتیـیە بۆ زمانی کوردی . هەوڵی زۆری داوە فەرهەنگەکە زۆرترین ووشەی دیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی بکەوێتە ناو لاپەڕەکانیەوە ، وەکو بابانی (سلێمانی) ، سۆرانی ، زازایی ، بۆتانی ، بادینانی ، لوڕی ، فەیلی ، لەکی ، موکری ، هەورامی ، ئەردەلانی .

لە پێشەکیدا دانەر بە کورتی لە مێژووی دانانی فەرهەنگی کوردی دواوە لەپێش ئەم فەرهەنگەی خۆی ، باس لەو فەرهەنگانە دەکا کە لەلایەن زانایانی کورد و ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسەکانی ئەورووپا دانراون . لە مانە «نەوبار»ی ئەحمەدی خانی (١٦٥٠ ـ ١٧٠٧) و «ئەحمەدی» شێخ مارفی نۆدی (١٧٥٢ـ١٨٣٨) ، فەرهەنگی کوردی ـ فرەنسی ئەلێکساندر ژابا ، فەرهەنگی کوردی ـ عەرەبی «الهدية الحميدية في اللغة الكردية»ی یووسف زیائەدین پاشای خالیدی ، فەرهەنگی کوردی ـ ئینگلیزی ئی . بی . سۆن ، فەرهەنگی عەرەبی ـ کوردی (ڕابەر = المرشد)ی گیوی موکریانی ، فەرهەنگی کوردی ـ فارسی ـ عەرەبی شێخ محەمەد مەردۆخ (ل ١١ ـ ١٦) .

به یارمەتیی وەزارەتی مەعاریف لە چاپدرا

جزمی یەکەم

لە

# فەرهەنگی خاڵ

نوسراوی

شێخ

## محمدی خاڵ

سلیمانی

١٣٧٩ هجری — ١٩٦٠ میلادی

٢٥٧١ کوردی

دانەر بە کورتی باس لە پەیدابوونی ووشە و زمان دەکا ، بەسەرهاتی زمان دەگێڕێتەوە بەتایبەتی ئەوەی پێوەندی بە یەکگرتن و جیابوونەی دیالێکتەکانی زمانەوە هەیە ، ئینجا دەکەوێتە گێڕانەوەی نەژادی زمانەکان بەهۆی ووشەکانیانەوە ، لە بنەماڵەیان دەگەڕێ (ل ١٩ ـ ٢٠) . لە بابەت زمانی کوردیەوە دەڵێ لە بنەماڵەی زمانەکانی هیندوئەوروپیەیە (ل ٢٠ ـ ٢٢) . لە دوای ئەمە باس لە زمانی کوردی دەکا ، لە بناغەی دیالێکتەکانی دەکۆڵێتەوە . لە بارەی نووسینی زمانی کوردیەوە لەسەر ئەو بیروڕایەیە پێویستە بە ئەلفوبێی عەرەبی بنووسرێتەوە . مەبەسی ئەوەیە ئەم ئەلفوبێیە ببێتە بناغە بۆ نووسینی کوردی لە دوای دەسکاری کردن ، چونکە هەندێ تیپ (دەنگ) لە زمانی عەرەبیدا بەرچاو دەکەون کەچی بۆ زمانی کوردی بە کەڵك نایەن ، پێچەوانەش هەیە ئەو تیپانەی لە زمانی کوردیدا هەن و لە زمانی عەرەبی نین . پێویستە لە تیپە عەرەبیەکان بە گۆڕین و دەسکار کردنی وێنەیان تیپی تازە دروست بکرێن . جگە لەوە تیپە بزوێنەکان ئەوانەی لە زمانی عەرەبیدا بەرچاو ناکەون ئیشارەتیان بۆ دابنرێ (ل ٢٧ ـ ٣١) .

لە پێشەکییەکەیدا شێخ محەمەدی خاڵ شەش لاپەڕەی تەرخان کردووە بە کورتی لە دەستووری زمانی کوردی (ڕێزمانی کوردی) دەدوێ ، لایە گرنگەکانی ڕوون دەکاتەوە و هەوڵ دەدا زانیارییەکانی حەقیقەت و فاکتی قوتابخانەیی بن (ل ٣١ ـ ٣٦) . لەمەوە دەرباز دەبێ بۆ شی کردنەوەی هەندێ لایەنی ئەداتەکانی شەرت ، ئەوانەی دانەر لە فەرهەنگەکەیدا دەست نیشانیان دەکا . ئەوەی گرنگ بێ لەم لایەنەوە ئەوەیە هەر ووشەیێکی بۆ ئەم

مەبەسە بەکارهێنا بێ ، لە ووشەکە وورد دەبێتەوە و نەژادی دیار دەکا لەڕووی دیالێکتەوە ، واتە پەنجە بۆ نەژادی ووشەکە درێژ دەکا و لە لای چەپیەوە ناوی دیالێکتەکە دەنووسێ ، وەکو زازایی ، هەورامی ، بادینانی ، ئەردەلانی ، لوڕی ، فەیلی ، لەکی . . هتد . گرنگی کارەکە تەنیا لەوەدا نییە دانەری فەرهەنگ نەژادی ووشەکە دەخاتە بەرچاو ، بەڵکو ماناشی ڕوون دەبێتەوە لەو دیالێکتەی کە ووشەکە چۆتە ناو فەرهەنگیەوە . ئەم دیاردەیە سوودی زۆرە بۆ دەوڵەمەند کردنی زمانی ستانداردی نووسینی کوردی . بۆ بەڵگە ووشەیێك لە دیالێکتی بادینانی یا لوڕی، لە جێی خۆیدا مانای تایبەتی هەیە ، دیارە لە زمانی نووسینیش بەکار نەهاتووە ، ئیتر نووسەری کورد دەتوانێ ئەم ووشەیە بە مانای خۆی بەکاری بێنێ لە نووسین دا ، یا بە مانایێکی نزیك مانای خۆی . وەکو ئەوەی ووشەی ((خەبات)) لە دیالێکتی کرمانجیی باکووردا بە مانای (کار ، کارکردن ، ئیش کردن، ڕەنجکێش) هاتووە ، بەڵام لە زمانی ستانداردی نووسین ووشەی ((خەبات)) مانای (تێکۆشینی سیاسی = النضال ، الکفاح) هاتووە .

دانەر تەنیا ئاماژەی بە نەژادی هەموو ووشەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی کردووە تەنیا دیالێکتی کرمانجی باشووری بەشی کوردستانی عیراق نەبێ ( هەولێر ، سلێمانی ، کەرکووك ، ڕواندوز . . . هتد .) چونکە ئەم دیالێکتە بە زمانی ستانداردی نووسینی کوردی دەزانێ کە زمانی ڕەسمی فەرهەنگەکەی خۆیەتی ، لێکدانەوە و روون کردنەوە و بەڵگەکانی و بە گشتی تێکستی کتێبەکە بەو دیالێکتەیە (ل ٣٦٤ ـ ٣٨٠) .

ئەگەر بەراوردێك لە نێوان ئەم فەرهەنگە و فەرهەنگەكەی پێشوو بكرێ ، گومان لەوەدا نامێنێ ئەمەیان كەڵكی لە ئەوی دیكە زیاترە وەك سەرچاوەییێكی گرنگ بۆ ئامادە كردنی فەرهەنگی گەورەی گشتی زمانی كوردی . تا دروست بوونی ئەو فەرهەنگە فەرهەنگی خاڵ لە دوو لاوە نرخێكی زۆری هەیە ، یەكەمیان وەك سەرچاوەییێكی پراكتیكی لەپێناوی زانینی مانا و بەكار هێنانی ووشەی كوردی لە نووسین دا ، چونكە ئەم فەرهەنگە لەبەر دەستی خوێنەر و خوێندەواری كوردی كوردستانی عیراق دایە ، هەرچی فەرهەنگەكەی مەردۆخیشە باوەر ناكرێ لە چوار پێنج دانە زیاتری لە هەموو كوردستانی عیراق دا هەبێ ، دووەمیان سەرچاوەییێكی بنچینەییە بۆ زانستی دیالێكتەكانی زمانی كوردی ، واتە بۆ زانستی دیالێكتۆلۆجی بەراوردكاری .

## فەرهەنگی مەهاباد (١٩٦١)

فەرهەنگی مەهاباد فەرهەنگێكی كوردی ـ عەرەبییە لە دانانی نووسەر و ڕۆژنامەنووسی خاوەن كۆواری «هەتاو» گیوی موكریانی ، لە ساڵی ١٩٦١ لە شاری هەولێر چاپ كراوە . دانەر ماوەییێكی زۆر خەریكی كۆكردنەوەی ووشەی كوردی بوو لە سەرچاوەی جیاواز. تەنیا بەوە نەوەستاوە سوود لە فەرهەنگەكانی پێش خۆی وەربگرێ ، بەڵكو تاقی كردنەوەی مەیدانی زۆر بوو، بەشێكی زۆری ووشەكانی لە دەمی خەڵكی وەرگرتووە ، كەسانی ناوچە جیاوازەكانی كوردستان . لە نزیكەوە من ئاگاداری ئەو كارەی بووم ، لە

چلەكانی سەدەی بیستەم هێشتا من منداڵ بووم هەستم بەوە دەكرد لە
گفتوگۆدا لەگەڵ خەڵكی ، ووشەییێك یا ڕستەییێك تازە بوایە بۆی تۆماری



زنجیرە : - ٤٤

فەرهەنگی

مەهاباد

فەرهەنگێكی قوتابخانەیی كوردی و آرەویی یە

( چاپی یەكەمین )

دانەر

گیو موكریانی

مافی چاپكردنەوە و هەموو جوورە مافێكی بۆ خاوەندی ڕادەگیرێ

هەولێر

چاپخانەی كوردستان

٢٥٧٣ ی كوردیی ١٩٦١م -

دەکرد و لە مانای دەپێچایەوە . کاتێکی زۆری لە ژیانی بۆ کۆکردنەوەی ووشەی کوردی و شوێنەواری شیعر و بەسەرهاتی شاعیران خەرج کرد .

لەپێشەکی فەرهەنگەکەیدا دەڵێ فەرهەنگێکی گەڵێ گەورەی کوردی ـ عەرەبی بە دەستەوەیە بە ناوی ((فەرهەنگی کوردستان)) [٢] ، ئامادەیە بۆ چاپ بەڵام تائێستا بەو ئامانجەی نەگەیشتووە ، لەبەر دەست کورتی و بێ دەرامەتی . کارێکی وا پوول و پارەیێکی زۆری گەرەکە ، لەبەر ئەوە داوای یارمەتی دەکا بۆ چاپ کردنی ئەم کارە گرنگە . ئەوەی شایانی باسە گیوی موکریانی ((چاپخانەی کوردستان))ی هەبوو لە هەولێر ، هەر چەندە بچووکیش بوو بەڵام هەندێ بەرهەمی پێ چاپ کردبوو .

لەو کاتەی ئەم فەرهەنگە بڵاوکرایەوە من لە شاری سانت پیترسبورگ (لینینگرادی ئەوسا) بووم لە ڕووسیا . لە نیشتمانەوە ئەم فەرهەنگەم بە دەست گەیشت ، لە پاش خوێندنەوەی فەرهەنگەکە نامەم بۆ خاوەنی نووسی ، ئەوەی لە بیرم مابێ لە نامەکەدا بۆم نووسی ((مامۆستا گیان! ئەگەر خۆت یاریدەی خۆت نەدەی ، بەتایبەتی خاوەن چاپخانەی ، خەڵکانی دیکە ناتوانن یارمەتیت بدەن ، کورد خۆی بێ لێفەیە بەڵام جەنابتان لێفە شڕێکی هەیە ، جا بۆچ یارمەتی لە خەڵکی داوا دەکەی!)) .

دانەر ئەم فەرهەنگەی بە کورتکراوەی ((فەرهەنگی کوردستان)) داناوە ، ئەلفوبێی عەرەبی لە نووسینەوەیدا بەکارهێناوە ، لەسەر بنچینەی تیپە دەنگدارەکانی و u ، وو û ، ۆ o ، ی î ، ێ ê ، هەروەها (ڕ) (ل ١٣ ـ ١٧) .

گیوی موکریانی ئەلفوبێی لاتینی جەلادەت بەدرخان بە چاکترین ئەلفوبێ دەزانێ بۆ نووسینی زمانی کوردی . لێرەدا ڕەنگە بیر لەوە بکرێتەوە لەبەر

چی ئەم فەرهەنگە و چاپەمەنیەکانی دیکەی زمانی کوردی لە چاپخانەکەی خۆیدا بە ئەلفوبێی لاتینی چاپ نەکردووە! بە لای ئێمەوە ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆی سەرەکی . یەکەمیان هەڵسوکەوتی سیاسی یاخود سۆسیۆپۆلیتیکی لە عێراق و کوردستانی عێراق ڕێگەی بەوە نەداوە پرۆپاگەندە بۆ ئەلفوبێی لاتینی بکرێ ، نەبوونی کەرەستەی چاپی ئەلفوبێی لاتینی لە چاپخانەکانی هەموو عێراق دا ، ئینجا زەمینەیێکی لە بار لە ناوەوە نەبوو زمانی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینی بنووسرێ چونکە ئەو ئەلفوبێیە باو نەبوو و خوێنەر و خوێندەواری کورد بێ ئاگا بوو لێی .

دانەر ئاماژە بەو سەرچاوانە دەکا کە سوودی لێ وەرگرتوون . ناوی هەموو ئەو ڕۆشنبیر و ناسراوانەی خۆی دەبا کە یاریدەیان داوە بۆ دانانی ئەم فەرهەنگە . ئەو کەسانە دانیشتووی مەهاباد و سلێمانی و بادینان و هەولێر و ڕواندز و کەرکوك و جێگەی دیکەی کوردستانی عێراق بوون (١٩ ـ ٢١) .

جگە لەم سەرچاوە مەیدانیانە کەرەستەی دیکەش کەڵکیان بۆی بووە ، وەکو فەرهەنگەکانی «نۆبار»ی ئەحمەدی خانی و «ئەحمەدی» شێخ مارفی نۆدێ و دەسنووسەکانی جەلادەت بەدرخان لە فەرهەنگی کوردی ـ فرەنسی بەتایبەتی بۆ گیوی موکریانی ناردووە . لەدوای ئەمە ناوی هەموو ناوچە و هەرێم و هۆز و عەشیرەتەکانی کوردەواری دەبا ئەوانەی ووشەی دیالێکتەکەیان هاتۆتە ناو فەرهەنگەکەوە .

دانەر بە کورتی باس لە دەستووری زمانی کوردی دەکا ، زانیاری لەمەڕ تیپە دەنگدار و بێ دەنگەکانی زمانی کوردی دەدا بە دەستەوە . ئینجا دەکەوێتە باسکردنی ناو بە هەر دوو بابەتەکەیەوە سادە و لێکدراو ، ئەوجا باس لە سیفەت ، جێناو ، فیعل ، بەرناو دەکا و لە دواییدا فیعل و یەکگرتنی

لەگەڵ یەکتری دەس نیشان دەکا (٧٥٢ ـ ٧٦٥) . لە کۆتاییدا فەرهەنگێکی بچووك دەخاتە ڕوو لە بابەتە ووشەی عەرەبییەوە بۆ کوردی ، چونکە فەرهەنگەکە وەکو ئاشکرایە کوردی ـ عەرەبییە (٧٧٦ ـ ٧٨٢) .

فەرهەنگی مەهاباد لەسەر بنچینەی ڕێزی ئەلفوبێی هیجا دامەزراوە بەپێی تیپە بێ دەنگەکان . هەندێ لە ووشەی تیپەکان بە لاتینیش تۆمار کراون ، بۆ ڕوون کردنەوە لە فەرهەنگەکەدا ووشەی لێکدراو و ڕستەی لێکدراو بەکارهاتووە وەك بەڵگە و ڕوون کردنەوەیێك . پێش ناو و پاش ناوی دەست نیشان کردووە لەگەڵ ئەدەوات لە زمانی کوردیدا .

بە هەموو جۆرێ ئەم فەرهەنگە وەك ئامادەکردنی سەرچاوە گەلێك بە کەڵکە بۆ نووسینەوەی فەرهەنگی گەورەی گشتی بە زمانی کوردی .

ئەم فەرهەنگە و هەردوو فەرهەنگەکەی پێشوو لە ڕووی بەرنامەی نووسینی فەرهەنگ (تەکنیکی) ئەو مەرجانەیان تێدا نییە بەتایبەتی لە ڕووی خاڵبەندیەوە کە لە ئەوروپا بە درێژایی ڕۆژگار دروست بووە . واتە زیاتر پێڕەوی شێوەی دانانی فەرهەنگی کلاسیکی کۆنی زمانی عەرەبی کراوە . هەر لەبەر ئەوەشە عەرەبەکان هەوڵ دەدەن فەرهەنگە کۆنەکانیان بگوێزنەوە بۆ ئەو بەرنامەیەی ئەوروپاییکان بە کاری دێنن . هەر چی فەرهەنگی تازەشە پێڕەوی ئەو بەرنامە تازەیە دەکەن لە دانانیدا ، وەکو فەرهەنگی «المنجد» .

لە بابەت کوردیشەوە لەمەودوا پێویستە بۆ دانانی فەرهەنگی کوردی ـ کوردی ، کوردی ـ بێگانە ، بێگانە ـ کوردی ڕەچاوی ئەو بەرنامە زانستییە تازەیە بکرێ .

# تێبینی

ئەم سێ فەرهەنگە کوردیەیە لە بابەت پیشان دانی ووشەی زمانی کوردی و پێڕەو کردنی بەرنامەی زانستی بێ کەموکووڕی نیەیە ئەگەر لەگەڵ ئەو فەرهەنگانە بەراورد بکرێن کە لە ئەوروپا بڵاودەکرێنەوە ، مەبەس ئەو فەرهەنگە کوردی و زمانەکانی ئەوروپایە کە تائێستا بڵاوکراونەتەوە ، لەگەڵ ئەوەش دا سەرچاوەییێکی گەلێك گرنگە لە ڕۆژی ئەمڕۆدا کە بزووتنەوەی نەتەوەیی و نیشتمانی کورد لە قۆناغێکی پڕ لە تەنگوچەڵەمە دایە بەتایبەتی لە کوردستانی عێراق . دیارە ئەم فەرهەنگانە ئەگەر لە ڕووی سیاسیەیەوە نرخێکی گرانیان هەبێ لە ڕووی ڕۆشنبیری و خوێندەواریەوە نرخیان گرانترە .

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەم فەرهەنگانە ووشەی دیالێکتی سەرەکی زمانی کوردیان گرتۆتە خۆ کە لە دوو دیالێکتی بچووکی کرمانجی باکوور و کرمانجی باشوور پێك هاتووە . ئەوەی ئاشکرایە لە ڕۆژی ئەمڕۆدا ئەم دوو دیالێکتە لە ناوەوەیە و لە برەودایە . دیالێکتی کرمانجی باکوور لە کوردستانی تورکیا و کوردستانی سووریا و ناوچەی بادینانی کوردستانی عێراق و هەندێ لە ناوچەکانی کوردی ئازربێجان و ئەرمەنستان و گورجستانی قەفقاسی ڕووسیا و کوردی تورکمانستانی ئاسیای ناوەڕاست لە ناوەوەیە . هەر چی دیالێکتی کرمانجی خواروشە لە کوردستانی ئێران و کوردستانی عێراق لە ڕووە . لەبەر هەندێ هۆی مێژوویی لێرەدا جێی باس نیەیە ، ئەم دیالێکتەیان وەك زمانی ئەدەبی یەکگرتووی نووسینی کوردی گەلێ پێشکەوتووە ، لە ڕۆژی ئەمڕۆدا بووە بە ڕەمزی میللەتی کورد .

لەو کاتەی لەم هۆڵەدا ئەم زانیاریانە پێشکێش دەکەم شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ لە بەشی زۆری ناوچەکانی کوردستانی عێراقی سەر بە جوگرافیای دیالێکتی کرمانجی باشوور لە لووتکەی داگیرسانیدایە .

ئەم فەرهەنگانە وەکو دەردەکەوێ بە زۆری لە ووشەی دیالێکتی کرمانجی باکوور و باشوور پێك هاتوون کەڵکی ئەوەیان زۆرە وەك سەرچاوەیێك بۆ بەراوردکردن لە نێوان هەر دوو دیالێکتەکەدا بەکاربهێنرێن . ئەگەر لە ناو ووشەکانی فەرهەنگەکاندا ووشەی هەندێ دیالێکتی دەرەوەی دوو دیالێکتە کرمانجییەکە بکەونە بەرچاو ، ئەمانە سەرچاوەیێکی گرنگن بۆ دەوڵەمەند کردنی زمانی نووسینی ستانداردی کوردی .

بە لای ئێمەوە هەر لە ئێستاوە پێویستە ووشەکانی ئەم فەرهەنگانە بخرێنە سەر کارت لە لایەن ئەو لیجنەیەی بڕیاری لەسەر دراوە بۆ نووسینەوە و ئامادە کردنی فەرهەنگی کوردی - ڕووسی (سۆرانی)[٣] لە بەشی کوردی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیەی زانستی سانت پیترسبورگ .

ئەوەی جێی شادیە ئەوەیە لە سەدەی نۆزدەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم کوردناسی و ڕۆژهەڵاتناسی ئەورووپا بایەخی بە کولتووری کوردی داوە بەتایبەتی زمان ، لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە بزووتنەوەیێکی دڵخۆشکەرەوە هەیە لەم لایەنەوە بەتایبەتی لە کوردستانی عێراق و هەندێ لە ناوچە کوردیەکانی وولاتی سۆڤیەت و شارەکانی مۆسکۆ و لینینگراد (سانت پیترسبورگی ئێستا) .

## پەراوێز

١) شێخ محەمەدی خاڵ وەکو خۆی نووسیویەتی لە ڕۆژی ١٩٣٦/٤/٦ دەستی کردووە بە دانانی فەرهەنگەکەی و لە ڕۆژی ١٩٥٩/٦/٣ کۆتایی پێ هێناوە ، بەم پێیە نزیکەی چارەکە سەدەیێك خەریکی بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کارەی بووە .

بەرگی دووەمی فەرهەنگی خاڵ لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٦٤ لە (٣٩٢) لاپەڕەدا بڵاوکراوەتەوە ، ووشەی دەنگەکانی ((چ ح خ د ر ز س ش ع غ ف ڤ))ی تێدا تۆمار کراوە .

بەرگی سێیەمی فەرهەنگەکە لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٧٤ لە (٥١١) لاپەڕەدا بڵاوکراوەتەوە ، ووشەی دەنگەکانی ((ق ك گ ل م ن و ھ ی)) تێیدا تۆمار کراوە . لە کۆتایی ئەم بەرگەدا کۆمەڵێك ووشەی تازەی بڵاو کردۆتەوە لە ووشەی هەموو تیپەکانی ئەلفوبێی کوردی ، لە بەرگەکانی پێشوودا بڵاو نەکرابوونەوە .

٢) لەپێش چاپ کردنی فەرهەنگی مەهاباد ، گیوی موکریانی دوو فەرهەنگی دیکەی بە چاپ گەیاند بوو لە هەولێر ، یەکەمیان فەرهەنگی ڕابەر (عەرەبی - کوردی) لە ساڵی ١٩٥٠ ، دووەمیان کۆلکەزێڕینە لە ساڵی ١٩٥٥ - ١٩٥٦ .

لە دوای فەرهەنگی مەهاباد ، بەرگی یەکەمی فەرهەنگی نۆبەرەی لە ساڵی ١٩٨٦ و بەرگی دووەمی لە ساڵی ١٩٩٠ لە بەغدا چاپ کردووە . ئینجا ((فەرهەنگی کوردستان))ی لە هەولێر لە ساڵی ١٩٩٩ بە چاپ گەیاندووە . بەشێکی هەر دوو بەرگی فەرهەنگی نۆبەرە لە ساڵی ٢٠٠٣ لە هەولێر چاپ کراوە .

٣) له ساڵی ١٩٦١ له دوای جێگیر بوونم وەك قوتابی خوێندنی باڵا له ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیەی زانستی له شاری سانت پیترسبورگی ڕووسیا ، بەشی کوردی بیری له دانانی فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی (سۆرانی) کردەوه . بۆ ئەم مەبەسه لیجنەییێکیان دەست نیشان کرد بۆ دانانی فەرهەنگەکه له قەناتی کوردۆ و زاریێ یووسف و من . دەست کرا به کار . ئەوەی به من سپێررا بوو ، چەند تیپێکی ئەلفوبێی کوردی بوو دەبوو ووشەی ئەو دەنگانه کۆ بکەمەوه ، تا ئەو کاتەی لەوێ کارگەری زانستی بووم درێغیم لەم کارەدا نەکرد .

له زستانی ١٩٦٨ گەڕامەوه نیشتمان ، قەناتی کوردۆ ئارەزووی ئەوەبوو من وەکو دانەرێکی فەرهەنگەکه له لیجنەکەدا بمێنمەوه ، بەڵام من بەمه ڕازی نەبووم، چونکه دەمزانی کاری ڕۆژێك و دوو ڕۆژ نیيه ، لەبەر ئەوه پێشنیازی من ئەوه بوو له پێشەکی فەرهەنگەکەدا ئاماژه بۆ ئەوه بکرێ که منیش بەشداریم تێدا کردووه .

له دوای ١٥ ساڵ پاش گەڕانەوەم بۆ نیشتمان له ساڵی ١٩٨٣ فەرهەنگەکه به ناوی قەناتی کوردۆ و زاریێ یووسف دەرچوو و بڵاوکرایەوه .

# ملخص البحث

## ثلاثة معاجم كردية

**د. معروف خزنەدار**

كان هذا البحث الذي يُنشر في هذه المجلة في الاصل محاضرة أُلقيت في المؤتمر المحلي للدراسات اللغوية الذي أقامه معهد الدراسات الشرقية التابع لأكاديمية العلوم في سنة ١٩٦٤ في مدينة سانت بطرسبورغ الروسية (لينينغراد آنذاك) .

والبحث يتضمن معلومات ضافية عن ثلاثة معاجم صدرت في أواسط القرن العشرين في كل من العراق وايران . والمعاجم الثلاثة هي:

١ـ معجم مردوخ للمؤرخ والباحث الكردي الشيخ محمد مردوخ الكردستاني، صدر في سنة ١٩٥٦ في طهران.

٢ـ معجم الخال للكاتب والباحث الكردي الشيخ محمد الخال، صدر في سنة ١٩٦٠ في السليمانية.

٣ـ معجم مهاباد للكاتب والصحافي الكردي گيو المكرياني، صدر في سنة ١٩٦١ في أربيل.

لهذه المعاجم الثلاثة أهمية كبيرة لأنها أصبحت فيما بعد مصدراً مهماً لوضع المعجم العام الوسيط للغة الكردية رغم عدم التزام مؤلفيها بصورة كاملة بالمنهج العلمي المعمول به لتأليف المعاجم، الاّ انها كمادة اولية لها أهمية كبيرة لتأليف المعاجم الكردية في المستقبل وكذلك لوضع المعجم العام الوسيط للغة الكردية.

## Abstract
## Three Kurdish Dictionaries

**Dr. M. Khaznadar**

Originally, the study was presented to the local congress of linguistics, held by the Institute of Oriental Studies of Science Academy in 1964, Saint Peterburg, Russia.

The study is included with abundant facts on three dictionaries published in the midst of twentieth century in Iraq and Persia.

1- Mirdokh Dictionary: by Kurdish historian and scholar, Sheikh Muhemmed Mirdokh Kurdistani 1956-Tehran,
2- Khal Dictionary: by Kurdish writer and scholar, Sheikh Muhemmed Khal, Sulaimania-1960.
3- Mahabad Dictionary: by Kurdish journalist and scholar Giw Mukiryani, Erbil-1961.

All the mentioned three dictionaries have their great significance being major basis and source to compile a general mediun Kurdish dictionary. However, the compilers were not committed to scientific approach but their work is helpfut and beneficial to compile Kurdish dictionaries in future.

# پووری فەرەیدوون

د. محەمەد نوری عارف

## شاعیرێکی کوردی کۆتایی سەدەی حەوتەم و سەرەتای سەدەی هەشتەمی کۆچی و شیعرەکانی لە ناو شیعرە چاپکراوەکانی بابا تاهیردا.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر بنچینەی وتارێ هاتۆتە ئەنجام کە دکتۆر جەمشید سەداقەت کیش، نزیکەی شەش ساڵێ لەمەوبەر پێشکەشی کۆنگرەی رێزلێنانی بابا تاهیری عوریانی کردووە لە هەمەداندا. ئینجا لە کتێبەکەیدا (کردان پارس و کرمان)[1] بلأوی کردۆتەوە. منیش لە فارسییەوە کردوومە بە کوردی، پێشەکیم بۆ نووسیوە، چوارینەکانم هێناوەتە سەر رێنووسی ئەمرۆی کوردی، چوارینەکانم لێکداوەتەوە، فەرهەنگۆکم بۆ کردووە، پەراوێزم بۆ داناوە.

## پێشەکی

لێکۆڵینەوە و بیرورِا دەربرِین لەبارەی پووری فەرەیدوونەوە لە دەوروبەری کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی رابوردووەوە دەستی پێکردووە و لەم بارەیەوە هەندێ بۆچوون هەیە، لە هەموویان گرنگتر سەلماندنی ئەوەی کە پووری فەرەیدوون کورد بووە و بە زمان و شێوەی بابا تاهیر شیعرەکانی

بە چوارینە داناوە لەبەر ئەوەی کە بە یەك زمان شیعریان داناوە و ڕێباز و ناوەرۆك و بابەتەکانیان لە یەکەوە نزیك بووە، ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی کە چوارینەکانیان تێکەڵی یەکتری ببێ بە جۆرێ کە ڕۆژگارێکی زۆر دوور و درێژ، خوێنەرانی ئەم چوارینانە هەستیان بەم تێکەڵییە نەکردووە، بێگومان جیاکردنەوەی ئەم تێکەڵییە لە یەکتری کاری پسپۆڕانی شارەزای ئەم زەمینەیەن، ئەمەیش کاتێ کە دەستی شارەزایان گەیشتە ئەو سەرچاوە و کەشکۆڵە کۆنانەی کە لەبارەی شاعیری ناوبراوەوە شتیان نووسیوە و نموونەی چوارینەکانیان پیشان داوە کە بەشێوەی لوڕی نووسراون و دەڵێن پووری فەرەیدوون کورد بووە و بە زمانی خۆی شیعری داناوە، لە ئەنجامدا تێکەلاوی چوارینەکانی بابا تاهیر بووە، ئەمە بۆ خۆی دان پێدانانێکە بەوەی کە بابایش کورد بووە و زمانەکەیشی شێوەزاری لوڕی بووە. بەلاَم گومانی تێدا نییە کە زمانی ڕەسەنی چوارینە چاپکراوەکانی هەردوو شاعیر زمانی ئەو چوارینانە نین کە دایان ناون، بەڵکو گەلێ گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و زیاتر لەوە دەچن کە فارسی بن ناکوردی، هۆیەکەیشی دیار و ئاشکرایە وەکو لە پێشەکی زۆربەی چوارینە چاپکراوەکانی بابا تاهیردا، دان بەوە دانراوە، کە بەشی زۆری نووسەری دەستنووسی ئەو شیعرانە، شارەزای زمانی بابا تاهیر نەبوون و لە گەلێ وشە و زاراوە و دەربڕین بە باشی تێنەگەیشتوون و زمانی ڕەسمیش فارسی بووە و، ئەوەی کە لێی تێنەگەیشتوون، یان لە فارسییەوە نزیك بووە، بە ئارەزوو و سەلیقەی خۆیان گۆڕیویانە بە وشەی فارسی. هەروەها سادەیی و دڵڕفێنی و جۆش و خرۆشی ئەو چوارینانە بۆتە هۆی ئەوەی کە دەم بە دەم و، پشتا و پشت و نەوە لەدوای نەوە، بۆماوە و ڕۆژگارێکی درێژ نەقڵ ببێ، تا دەگاتە ئەمڕۆ، بێگومان ئەمەیش دەبێتە هۆی

پەیدابوونی گۆڕان و جیاوازی لە شیعرەکاندا، دیارە چوارینەکانی پووری فەرەیدوونیش، بە هەمان شێوە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە لەو ماوە دوور و درێژەدا، بۆ سەلماندنی ئەمە تێکستی کۆنی نووسراوی ئەو شیعرانە بە دەستەوەیە کە زۆر جیاوازیان هەیە لەگەڵ ئەو چوارینە چاپکراوانەی کە باسکرا. یەکەم ئەو بیست و پێنج دێڕە شیعرەیە کە (مینەوی) لە ژمارەی دووەمی ساڵی چوارەمی گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیاتی زانستگای تاران، بڵاوی کردۆتەوە کە پێکهاتووە لە دوو پارچەی سێ بەیتی و شەش بەیتی و هەشت دوو بەیتی، ئەم شیعرانەی وەرگرتووە لە کۆمەڵە دەستنووسی ژمارە (٢٥٤٦)ی مووزەی قۆنیە، کە ڕێکەوتی ساڵی ٨٤٨ کۆچی نووسراوە[٢]. ئەو بیست و پێنج دێڕە شیعرەی بابا تاهیر کە سەدەها ساڵ دوای کۆچ کردنی بابا نووسراوە، بەهیچ جۆرێ زمانەکەی لە زمانی ئەو چوارینانە ناچێ کە جارەها چاپ کراون و یەك لەدوای یەکتری چاپ دەکرێن، بەڵکو نزیك دەبێتەوە لە زمانی بابا تاهیر، ساڵەها ئەو شیعرانە بەو جۆرە مانەوە، تا (مهرداد بهار) لەژێر ناونیشانی (گویش بابا طاهر) واتە شێوە زمانی بابا تاهیر لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر ئەنجامدا، واتای وشەکانی نووسییەوە و، لەگەڵ زمانە ئێرانیە کۆنەکانی پێش ئیسلام و پێش زاییندا بەراوردی کردوون و دوای ئەوە واتای شیعرەکانی نووسیوە[٣]. هەروەها کۆنترین شیعری پووری فەرەیدوون کە تائێستا بە دەستەوە بێت نموونەیەکە پیشان دراوە لە (فرهنگ جهانگیری ـ تألیف جمال الدین حسین بن فخرالدین حسن اینجو، چاپ سال ١٠٠٥هـ.ق) و هەروەها لە چاپە جیاجیاکانی هەمان فەرهەنگدا بەشێوەی جیاواز هاتووە، دیسان لە دەستنووسەکەی (علی اصغر حکمت)دا هاتووە، وەکو سەعیدی نەفیسی پیشانی داوە، بە جۆرێ گۆڕانی بەسەردا هاتووە، کە دەڵێ نەڕاست

دەکرێتەوە، نەدەتوانرێت لێکبدرێتەوە، ئەمەیش تەنها دێڕە شیعرێکە و ئەوانەی کە نووسیویانەتەوە یان چاپیان کردووە، دیارە کە زمانی پووری فەرەیدوونیان نەزانیوە، یان نەیان توانیوە بەڕاستی بیخوێننەوە، کە ئەویش زمانی کوردی بووە.

* * * * * *

**<u>* نووسین و خوێندنەوەی چوارینەکان:</u>** هەر لە کۆنەوە ئەو چوارینانە بە ڕێنووسی فارسی نووسراون و کاتێ کە ئەو چوارینانەیان لەو دەستنووسانەوە وەرگرتووە و چاپیان کردووە، بە هەمان ڕێنووسی چاپکراوە کە بزوێنە کورتەکان واتە بۆر و سەر و ژێر (= ضمه، فتحه، کسره) دیارنین، بەڵام لە خوێندنەوەدا بەزۆری وەکو فارسی خوێندوویانەتەوە، ئێمەیش تاڕادەیەکی زۆر هەمان جۆری خوێندنەوەمان خستۆتە سەر ڕێنووسی کوردی بەپێی سەلیقە و بۆچوونمان، بەڵام بۆ ئەوەی کە تام و بۆی لوڕی بدرێتێ ساڵەهایە لە ئێراندا (ضمه)ی عەرەبی دەخرێتە پێش جێناوی کەسی یەکەمی تاك، کە ئێمە بە (و)ی دەنووسین لە ڕێنووسی کوردیدا بۆ نموونە: (دلانەم، نەنالەم) دەکەن بە (دلانوم، نەنالوم) کە ئەمە شێوە زمانی ئاسایی خوراسانیی و فارسییە نا لوڕی، بەڵام ئەگەر وەکو لوڕی بخوێنرێتەوە بە (کسره)ی عەرەبی دەخوێنرێتەوە و دەبێ بوترێ: (دلانیم، نەنالیم)، وای لێهاتووە ئەمەیان کە لوڕییە لای زۆر کەس نا ئاساییە.

ئێمە لێرەدا بەپێی بیروڕای (ابراهیم صفایی مەلایری) چوارینەکان دەهێنینە سەر ڕێنووسی کوردی، کە ناوبراو لوڕستانییە و خەڵکی شاری (مەلایر)ە و شارەزای لوڕییە، وتارێکی نووسیوە لەبارەی بە هەڵە خوێندنەوەی چوارینەکانی بابا تاهیر لەژێر ناونیشانی (غلط خوانی ترانەها) و

له (مجـله ارمغان ـ سال ٣١ ـ ١٣٤١ش، ش٧، ص٢٩٨) بلاّوی كردۆتەوە، دوای ئەوە لە كتێبی بابا طاهر نامەدا چاپكراوە و لێرەدا دەخرێتە ڕوو. ناوبراو دەڵێ:

ساڵەهایە كە لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و كۆڕی ماتەمینی و شادیدا چوارینەكانی بابا تاهیر بەشێوەیەكی هەڵە دەخوێنرێتەوە، بەداخەوە گەیشتۆتە ڕادەیەك كە زمانی ڕەسەنی بابا تاهیر لە بیرچۆتەوە، بە جۆرێ ئەگەر كەسێ چوارینەكانی ئەو بە ئاوازی ڕەسەنی خۆی واتە شێوەی لوڕی بخوێنێ، خەڵكی بە گران و نائاسایی دێتە گوێیانەوە و دەیبیستن، ئەمڕۆ زۆر لە گۆرانی بێژەكان، بۆ ئەوەی شیعری ئەمڕۆ ڕەنگ و بۆی شێوە زمانی ناوخۆ (= محلی) بدات بە شێوەی (محلّی) دەیخوێننەوە و ڕاناوی كەسی یەكەمی تاك (مَن) بە (مو) دەخوێننەوە، لەسەر كێشی (دو)، ئینجا تیپی ڕاناوی كەسی یەكەمی تاك (م) بە دانانی (ضمه) واتە واوی كورت لەپێشیدا دەخوێننەوە، لەباتی (ڕەفتەم) دەڵێن (ڕەفتوم)، لەسەر كێشی (كەژدوم)، بەم جۆرە گۆڕانكاری دەنگەی چەند ڕاناو لە شیعری ئاسایی ناوخۆ (محلی) دروست دەكەن، لە چوارینەكانی بابا تاهیریشدا هەمان كار ئەنجام دەدەن، واتەی ڕاناوی كەسی یەكەمی تاك بە (مو) و ڕاناوی لكاوی كەسی یەكەمی تاك (ضمه) واتە واوی كورت دەخرێتە پێشی، وەكو لەم دوو بەیتییەدا:

مەكـــەز ســـــووتە دلانـــــەم چـــون نەنالـــــەم
مەكـــەز بـــــی حاســـــیلانەم چـــون نەنالـــــەم
نشـــستـە بـولبـــولان بـــا گـــول بنـالـــــەند
مەكـــە دوور ئـــــەز گولانـــــەم چـــون نەنالـــــەم

* * * *

که ڕاناوی جیای کەسی یەکەمی تاك (مەن) لە سەرەتای نیوە بەیتەکانی یەکەم و دووەم و چوارەم، لە شێوەی لوڕی و زمانی بابا تاهیردا (مە)یە، واتە دەنگی میمی مەکسووری هەیە (= مِە)، جێناوی کەسی یەکەمی تاك لە وشەی (نەنالەم، گولانەم)، بە گوێرەی شێوە زمانی لوڕی و زمانی بابا تاهیر بە شێوەی مەکسووری پێش خۆی دەخوێندرێتەوە و کێشی ئەم دوو وشەیە لەسەر کێشی وشەی (مکارِم) یان (محارِم)ە. بەلأم بە داخەوە لە هەموو شوێنێ شیعرەکانی بابا تاهیر بە هەڵە دەخوێندرێتەوە و ڕەسەنایەتی شێوەی لوڕی بریندار دەکەن، ڕاناوی (مەن) بە (مو)، لەسەر کێشی (دو) یان (مو) لەسەر کێشی (بو)، لەپێش جێناوی کەسی یەکەمی تاك واوێکی کورت (=ضمە) بەکاردێنن، کە ئەمە شێوەی زمانی ئاسایی خوراسانی و فارسییە وەکو:

موکـــــەز ســــووتە دلانــــوم چـــون نـــەنالوم
موکـــــەز بـــی حاسیلانـــوم چـــون نـــەنالوم
نیـــشەستە بـــولبولان بـــا گـــول بنالەنـــد
موکـــەز دوور ئـــەز گولانـــوم چـــون نـــەنالوم

* * * *

لە خوراساندا جێناوی کەسی یەکەمی تاك (مو) لەسەر کێشی (دو). وە لە فارسیدا لەسەر کێشی (تو) بەکاردەهێنرێ، هەروەها لە هەمان دوو ناوچەیەدا لەپێش جێناوی کەسی یەکەمی لکاو واوێکی کورت دێت (= ضمە)، بەم جۆرە لە چوارینە (محلی)یەکانی ئەم دوو ناوچەیەدا جێناوی ناوبراو بەشێوەی (محلی) بەکاردێت.

بەڵام خۆ چوارینەکانی بابا تاهیر بەشێوەی خوراسانی و فارسی نەوتراوە، بەڵکو بەشێوەی ڕەسەنی لوڕی کە زمانی بابا تاهیر خۆیەتی وتراوە و دەبێ بە هەمان شێوە و زمان بخوێندرێتەوە، هەروەها جێناوە ناوبراوەکان تا ئێستایش لە لوڕستان و لە شێوەی ناوخۆی هەمەدان و مەلایر، بە هەمان جۆر کە باسکرا بەکاردێت.

لەبەر ئەوە شایستەیە کە لە شێوەی ڕەسەنی بابا تاهیردا گۆڕانی نابەجێ نەکرێت و خوێنەرانی چوارینەکانی ئەو بە هەمان شێوە زمانی راستیی ئەو بوترێت، کە ئەڵبەتە خۆشتر و دلڕفێنتر دەبێت[٤] .

بابێینەوە سەر بابەتەکەمان، پووری فەرەیدوون و شیعرەکانی لەناو شیعرە چاپکراوەکانی بابا تاهیردا:

پووری فەرەیدوون شاعیرێکی ڕەنجەڕۆ و عاریف و خواناس و قسەزان بووە، کە لە هەر وتەیەکیدا ڕازێکی تێدایە، لە کۆتایی سەدەی حەوتەم و سەرەتای سەدەی هەشتەمی کۆچیدا ژیاوە. ئەوەی کە شایانی باسە ئەوەیە کە پووری فەرەیدوون شاعیری عیرفان و یەکتاپەرستی بووە، بە هەمان زمانی بابا تاهیر و بە هەمان کێشی شیعرەکانی، شیعری وتووە، ئەم لە یەکتری چوونە بۆتە هۆی ئەوەی کە شیعرەکانی تێکەڵاوی شیعرەکانی بابا تاهیر ببێ و لە هەندێ لە دیوانەکانی بابا تاهیردا شیعرەکانی پووری فەرەیدوون چاپ بکرێ.

**یەکەمین هەست کردن بەم ڕازە:** یەکەمین کەسێ کە هەستی کرد بە ڕازی تێکەڵ بوونی شیعرەکانی پووری فەرەیدوون لەگەڵ شیعرەکانی بابا تاهیردا دکتۆر پەروێز ناتل خانلەری بوو ئەویش لەکاتێکدا کە خەریکی لێکۆڵینەوەیەك بوو لەژێر ناونیشانی دوو بەیتییەکانی بابا تاهیر (دو بیتیهای

بابا طاهر)دا، له ساڵی ١٣٢٤ خورشیدی، واته نزیکەی شەست و یەك ساڵ لەمەوبەر له گۆڤاری (پیام نو، سال اول شماره ٨، آبان ١٣٢٤، ص ٣٢-٢٦) بڵاوکرایەوه.

دکتۆر خانلەری لەسەرەتادا، وا دەزانێ که هەندێ له چوارینەکان هینی بابا تاهیر نین و دەڵێ ئەم دوو بەیتییانەی خوارەوه هینی پووری فەرەیدوونن:

عـــــەزیزا مـــــەردی ئـــــەز نامـــــەرد نـــــایی
فـــــەغان و نالــــــه ئـــــەز بێـــــدەرد نـــــایی
حەقیقـــەت بـــشنەو ئـــەز پـــووری فەرەیـــدوون
کـــــه شـــــوعلەی ئـــــەز تـــــەنووری ســـــەردنایی

* * * *

واته: ئەی خۆشەویست مەردی لەدەستی نامەرد نایێ، گریان و ناڵه له بێ دەرد و ئازار نایێ، ڕاستی ببیسته له پووری فەرەیدوونەوه، که گڕ له تەنووری ساردەوه نایێ.

بـــــوره کـــــەز دیـــــده جـــــەیحوونی بـــــسازیم
بـــــوره لـــــــەیلی و مـــــــەجنوونی بـــــــسازیم
فەرەیـــدوونی عـــەزیز ئـــەز دەســـتی مـــو رەفـــت
بـــــوره ئـــــەز نـــــەو فەرەیـــــدوونی بـــــسازیم

* * * *

واته: وەره با له ڕووباری فرمێسکی چاومان ڕووباری جەیحوون دروست بکەین، وەره با داستانی لەیلێ و مەجنوون ساز بکەین، فەرەیدوونی خۆشەویستم لەدەست دەرچوو، وەره با سەرلەنوێ فەرەیدوونی ساز بکەین.

دووەمین کەسێ کە لەم بارەیەوە کاری کردووە سەعیدی نەفیسییە، یەکسەر دوای بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوەکەی دکتۆر خانلەری، وتارێ لەهەمان گۆڤاری ساڵی ١٣٢٤ی ژمارە (١١)ەدا، دەنووسێ و ئەم بۆچوونە باس دەکات:

**پووری فەرەیدوون لە کەشکۆڵەکاندا:** کۆنترین نووسراوێ کە لەبارەی پووری فەرەیدوونەوە شتێکی نووسیبێ و ناوێکی بردبێ (فرهنگ جیهانگیری ـ تالیف جمال الدین حسین بن فخرالدین حسن اینجو ـ سال ١٥٠٠هـ. ق)یە. لەم فەرهەنگەدا لەژێر واژەی "لو" Low دێڕە شیعرێکی بۆ بەڵگە بەم جۆرە خستۆتە ڕوو:

مخلـــف خالـــد از مـــو لـــو شـــکر کفـــاخش

حاجــت وصــف بنــده نــی هرکــه حــشن محــاحش

* * * *

ئەڵبەتە گومانی تێدا نییە کە ئەم دێڕە بە تەواوی شێواوە، بە جۆرێ کە ڕاست ناکرێتەوە. هەروەها لە (فرهنگ جیهانگیری) چاپکراویشدا، بە جۆرێکی شێواوتر ئەم دێڕە شیعرە هاتووە:

مختلـــف ســـال وار مـــو لـــو شـــکر کفـــاخش

حاجــت وصــف بنــده بــی هرکــه حــسن مخــاخش

* * * *

دیسان سەعیدی نەفیسی دەڵێ: لە دەستنووسێکدا شیعری سەرەوەی بەم جۆرە دیوە:

مخلـــف خـــال دارمـــو لوشـــکر و کفـــاخش

جاجـــت وصـــف بنـــدەنی هـــر خـــشن مجـــاخش

* * * *

هەمدیسان دەڵێ: لە دەستنووسێکی تردا هینی (علی اصغر حکمت)، دێڕە شیعری ناوبراو بەم جۆرە هاتووە:

مخلف خـــال دارمو لـــو شـــکر و کفاخش

حاجت وصف بنده نی هرکه خشن مجاخش

* * * *

**سەرچاوەیەکی تر:** لەپاش (فرهنگ جیهانگیری) کورتە باسێ لەبارەی ئەم شاعیرە بە جۆشە لە کتێبی (نظم گزیده) نووسینی (محمد صادق ناظم تبریزی) هاتووە.

(ناظم تبریزی) کە خۆی یەکێ بووە لە شاعیرانی پلەی دووەم، بە فەرمانی شا عەبباسی گەورە، دەبێ بەلێپرسراوی کۆکردنەوەی شیعری شاعیرانی ئێران و لەساڵی ١٠٣٦ کۆچی قەمەریدا کتێبەکەی تەواو دەکات. لەبارەی پووری فەرەیدوونەوە دەنووسێ: پووری فەرەیدوون لە کوردەکانی فارسە(٥)، بێ جۆش و خرۆش و حاڵ نەبووە، وتەکانی بۆنی ئێش و ئازاری لێدێت، ئەم چەند کڵپەیە لە وتەکانی ئەون:

عـــــەزیزا مـــــەردی ئـــــەز نامـــــەرد نـــــایی

فـــــەغان و نالـــــە ئـــــەز بـــــی دەرد نـــــایی

حەقیقـــەت بـــشنە و ئـــەز پـــووری فەرەیـــدوون

کـــە شـــوعلە ئـــەز تـــەنووری ســـەرد نـــایی

* * * *

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

عـــەزیزا رەخنـــە دەر ســـیندان کونـــەد عیـــشق

مـــەرەس دەر گـــەردەنی شـــیران کونـــەد عیـــشق

گـــــەدا و پادشــــــا و مـــــــیر و دەرویـــــــش
هەمـــە باخـــاکی رەھ یەکـــسان کونـــەد عیـــشق
* * * *

واتە: ئەی خۆشەویست، دڵداری کون دەکاتە سندانی ئاسنگەرییەوە، پەت دەخاتە ملی شێرانەوە، سواڵکەر و پاشا و میر و دەروێش، هەموویان وەکو خاکی ڕێگا لێدەکات.

دلا تـــا مـــن وە ســـەر[٦] داریـــم دەمـــی تـــە
نـــــەداریم عالـــــەمی جـــــوز عالـــــەمی تـــــە
جیهـــان بـــشی و دل بـــشی و جـــان شـــی
نەشـــی نەشـــی ز دل شـــەوقی غـــەمی تـــە
* * * *

واتە: ئەی دڵ تا من ناز و خۆشەویستی تۆم لەسەردا بێت، جیهانێکم نییە بێجگە لە جیهانی تۆ، جیهان دەڕوات و دڵ دەڕوات و گیان دەڕوات، ناڕوا لە دڵ ئارەزووی غەمی تۆ.

ز دیلـــم گـــەر ســـەبووری کـــەم نـــەبوودی
بـــە چـــەشمیم چـــەشمەیی زەمـــزەم نـــەبودی
نـــەداریم غـــەم خـــوری کـــەز غـــەم فیگـــاریم
گـــەریم غـــەم خـــوارە بـــودی غـــەم نـــەبوودی
* * * *

واتە: ئەگەر لە دڵمدا ئارامی کەم نەبوایە، لەبەر چاوم سەرچاوەی زەمزەم نەدەبوو (واتە تینووی تۆم)، غەم خۆرێکم نییە کە لە غەمدا بریندارم، ئەگەر غەم خۆرم هەبوایە غەم نەدەبوو.

دلا جـــــوز شـــــەوقی تـــــو بـــــازیم نـــــەبازیم

بـــــە جـــــوز تـــــو واکەســـــی ســـــازیم نەســـــازیم

تـــــویی نـــــاز و نیـــــازی هـــــەردو کـــــەونیم

بەجوز وەسلت ز حەق خوازیم نەخوازیم

* * * *

واتە: ئەی دڵ بێجگە لە ئارەزووی تۆ سەرگەرمی شتێکی تر نیم، بێجگە لە تۆ لەگەڵ کەسێکی تردا ناسازم، تۆی ناز و نیازی هەردوو دنیام واتە ئەم دنیا و ئەو دنیا، بێجگە لە گەیشتن بە تۆ لای خوا خواستێکی ترم نییە.

درا ئـــــەز گـــــەردی گـــــەردوون وا رەهـــــانیم

دمـــــی ئـــــەز خـــــاك و ئـــــەز خـــــوون وا رەهـــــانیم

چ ئـــــەم پیـــــچیدەئی پـــــووری فەرەیـــــدوون

ئەزین پووری فەرەیدوون وا رەهانیم

* * * *

واتە: وەرە لە غەم و خەفەتی ڕۆژگار ڕزگارم بکە، دەمێ لە دەردی سەری و خەفەت ڕزگارم بکە، چیت تێ پێچاوم... پووری فەرەیدوون، لەم پووری فەرەیدوونە ڕزگارم بکە.!

**دەستنووسێکی تر:** کەشکۆڵێکی دەستنووس کە نووسەرەکەی ناوی (ملا عبدالصمد سارَوی)یە و هینی سەدەی یانزەهەمی کۆچییە، کە شیعرەکانی پووری فەرەیدوونی تێدا نووسراوە و ژمارەیان ١٣ سیانزە دوو بەیتییە.

عـــــەزیزا مـــــەردی ئـــــەز نامـــــەر نـــــایی
فـــــەغان و نالـــــە ئـــــەز بـــــی دەرد نـــــایی
حەقیقـــەت بـــشنە و ئـــەز پـــووری فەرەیـــدوون
کـــە شـــوعلە ئـــەز تـــەنووری ســـەرد نـــایی

لێکدراوەتەوە.

* * * *

بـــــورە کـــــەز دیـــــدە جـــــەیحوونی بـــــسازیم
بـــــورە لـــــەیلی و مـــــەجنوونی بـــــسازیم
فەرەیـــدوونی عـــەزیز ئـــەز دەســـتی مـــو رەفـــت
بـــــورە ئـــــەز نـــــەو فەرەیـــــدوونی بـــــسازیم

لێکدراوەتەوە.

* * * *

مـــــورا نـــــە فکـــــری ســـــەودائی نـــــە ســـــوودی
نـــــە دەر دل فکـــــری بیهبـــــوودی نـــــە بـــــوودی
نـــــە خـــــواهیم جووکـــــەنار و چـــــەشمە ســـــاران
کـــــە هـــــەر چـــــەشمیم هـــــەزاران زینـــــدە روودی

* * * *

واتە: نە بیر لەسەودا و مامەڵە دەکەم نە لە سوود و دەسکەوت، نە لە دڵما بیری چاك بوونەوە دەکەم نە لە بوون و هەبوونی، کەناری جۆگەلە و سەرچاوەی ئاوەکانم ناویٚ، کە هەر چاوێکم ڕووباری زیندە روودە (واتە هەر چاوێکم بە ئەندازەی هەزاران زیندە روود فرمێسك دەڕێژیٚ).

ســـــــفاهوونیم ســـــــــفاهوونیم چ جـــــــایی
کــــە هــــەر یــــاری گـــــرفتم بـــــی وەفـــــائی
شـــــەویم یەکــــسەر بــــروونیم تــــا بـــــە شــــیراز
کــــە دەر هــــەر مــــەنزلیم ســــەد ئاشــــنایی
* * * *

واتە: ئیسفەهان، ئیسفەهان جێگای من نییە، کە هەر یارێکم پەیداکرد بیٚ وەفا بوو، یەکسەر دەڕۆم تا شیراز، لە هەر قۆناغێکدا سەد ئاشنایە.

ئەگـــەر چـــون مـــووم ســـەد ســـوورەت پـــەزیریم
بــە هـــەر ســـوورەت بــە دل نەقــشی تــو گیریــم
تــــو تــــا بـــــەختی منـــــی هـــــەرگیز نـــــەخوابیم
تــــو تــــا عــــومری منـــــی هـــــەرگیز نـــــەمیریم
* * * *

واتە: ئەگەر وەکو مۆم بە سەد جۆر بگۆڕێم، بۆ هەر جۆری نەخشی تۆ وا لە دڵمدا، تۆ تا بەختی من بیت هەرگیز نانووم، تا تۆ تەمەن (ژیان)ی منی هەرگیز نامرم.

مـــو ئـــەز قـــالوو بـــەلا تەشـــويش ديـــريم
گونـــەهـ ئـــەز بـــەرگ و بـــاران بـــيش ديـــريم
چـــو فـــەردا نوومـــە خوونـــوون نوومـــە خوونـــەن
مـــو دەركـــەف نوومـــە ســـەر دەرپـــيش ديـــريم
* * * *

واتە: من لە قالوو بەلا (قالوا بلى سورەی اعراف ٧ ئايەی ١٧٢) دەترسم، لە گەڵای درەختان و دڵۆپەی باران گوناهم پترە، كاتێ بەيانی (ڕۆژی قيامەت) نامە خوێنەكان نامەی (خەڵكی) دەخوێننەوە، من نامەی خۆم بە دەستەوەيە و سەرم شۆڕكردووە (لە شەرمەزاريدا).

ئەگـــەر مەســـتانی مەســـتيم ئـــەز تـــە ئيمـــان
وەگـــەر بـــی پـــاو دەســـتيم ئـــەز تـــە ئيمـــان
ئەگـــــەر گـــــەوريم و تەرســـــا وەر موســـــولمان
بـــە هـــەر ميللـــەت كـــە هەســـتيم ئـــەز تـــە ئيمـــان
* * * *

واتە: ئەگەر سەرخۆشی سەرخۆشەكانم ئيمانم بە تۆيە، وە ئەگەر بێ پێ و دەستم ئيمانم بە تۆيە، ئەگەر (گاور، زەردەشتی، بێ ئاين) و مەسيحی و ئەگەر موسوڵمانم، بە هەر ميللەت و ئاينێ كە هەمە ئيمانم بە تۆيە.

خوشـــــە ئانـــــان كـــــە ئـــــەڵلا پارشـــــان بـــــی
بـــــە حەمـــــد و قـــــول هـــــووەڵلا كارشـــــان بـــــی
خوشـــــە ئانـــــان كـــــە دايـــــم دەر نـــــەمازەن
بەهەشـــــــتی جاويـــــــدان بازارشـــــــون بـــــــی
* * * *

واتە: چەندە خۆشە ئەوانەی کە خوا یاریانە، کاریشیان بە حەمد و قول هووەڵلایە، خۆشە ئەوانەی کە هەمیشە خەریکی نوێژن، بەهەشتی هەمیشەیی جێگایانە.

کوشـــیمان گـــەر بـــەزاری ئـــەزکی تەرســـی
بروونـــی گـــەر بـــە خـــواری ئـــەزکی تەرســـی
بـــە ئـــین نیمـــە دل ئـــەز کـــەس مـــو نەتەرســـیم
دو عالـــەم دل تـــە داری ئـــەز کـــی تەرســـی
* * * *

واتە: ئەگەر بە پەرێشانی و دەردی سەری بمانکوژی لەکێ دەترسی، ئەگەر بەڕیسوایی دەرمان بکەی لەکێ دەترسی، بەو نیوە دڵە (کە هەمە) من لە کەس ناترسم تۆ دڵی هەردوو جیهانت هەیە لەکێ دەترسی.

عاشـــق ئـــون بـــی کـــە دایـــم دەر بـــەلا بـــی
ئـــەیووب ئاســـا بـــە کرمـــوون مومبتـــەلا بـــی
حەســـەن ئاســـا بنووشـــە کاســـەیی زەهـــر
حـــسین ئاســـا شـــەهیدی کەربـــەلا بـــی
* * * *

واتە: عاشق ئەوەیە کە هەمیشە لە بەلأدا بێت، وەکو ئەیووب گیرۆدەی کرم بێت (واتە کرمی تێبدات)، وەکو حەسەن کاسەی زەهر بنۆشێ، وەکو حسین شەهیدی کەربەلا بێ.

بــــه ئــــین بــــی ئاشــــنایی بــــەر کیــــان شــــیم

بــــه ئــــین بــــی خانومــــانی بــــەر کیــــان شــــیم

هەمــــه گــــــەر مــــو بروونــــــەن واتــــــه ئــــایم

تــــه ئــــەز دەرگــــەر بروونــــی وا کیــــان شــــیم

* * * *

واتە: بەو بێ ئاشناییەوە بۆ لای چ کەسانێ بڕۆم، بەم بێ ماڵ و حاڵیەوە بۆ لای چ کەسانێ بڕۆم، هەموو ئەگەر من دەربکەن لەگەڵ تۆدا دێم، ئەگەر تۆ لە دەرگاوە دەرم بکەیت لەگەڵ چ کەسانێکدا بڕۆم.

بــــــوره ســــــووته دلان تــــــا [مــــــا] بنــــــالیم

بیــــــا پەروانــــــــه بامــــــا تــــــا بنــــــالیم

ز عیــــــشقی ئــــــان گــــــولی رەعنــــــا بنــــــالیم

ز دەســــــــتی یــــــاری بــــــی پــــــەروا بنــــــالیم

* * * *

واتە: وەرن دڵ سووتاوەکان تا ئێمە بناڵێنین، وەرە پەپوولە لەگەڵ ئێمەدا تا بناڵێنین، لەبەر خۆشەویستی ئەو گوڵە جوانە دڵڕفێنە بناڵین، لە دەستی یاری بێ پەروا و بێ ترس بناڵێنین.

ز خــــور ئــــین چــــیهرەئەت ئەفرووتــــه تــــەر بــــی

تــــیری عیــــشقت بــــه جــــانیم رووتــــه تــــەر بــــی

مــــــەرا ئەختــــــەر بــــــووەد خــــــالی ســــــیاهەت

زمــــو یــــارا کــــه ئەختــــەر ســــووته تــــەر بــــی

* * * *

واتە: ئەم دەموچاوەت لە خۆر ڕووناك و درەخشانترە، تیری خۆشەویستیت بۆ گیانم کاریگەرترە، بۆ من خاڵە ڕەشەکەی تۆ ئەستێرەیە، ئەی یار ئەستێرە لە من سووتاوترە.

**پووری فەرەیدوون لە (آتشکدەی آذر)دا:**

(لطفعلی بیگ آذر بیگدلی، کۆچ کردووی ساڵی ١١٩٥کۆچی)، لە ئاتەشکدەی ئازەردا دەڵێ: پووری فەرەیدوون لە ویلایەتی فارسە، لێهاتوویەکە وەکو خاکەکەی پاکە و وتەکانی وەکو دڵی دەردناکە، عاریفێکی زانا و ڕابەرێکی شارەزا و بە توانایە لە قسەکردندا، بەڵام وتەکانی بە زمانی (ڕازی)یە[٧] و هەندێ جار دووبەیتی وتووە:

هـــەر ئـــانکوو لـــەعلی یـــارەش هـــالوو ئەمـــە
دەمـــادەم بـــەر تەنـــەش جـــانی نـــەو ئەمـــە
بەسەرشـــود زوڵمـــەتی پـــووری فەرەیـــدوون
کـــە دەر بـــالین مەهـــەش نیمـــە شـــەو ئەمـــە

* * * *

واتە: هەر کەسێ کە بەسەر دەم و لێوە سوورەکانی یارەکەیدا (وشەی) گەوجە و نەزان بێت، واتە پێی بڵێ نەزان، یان گەوجە..! ئەوا (لە خۆشیدا) دەماودەم گیانی نوێی بە بەردا دێتەوە، تاریکی و ناخۆشی پووری فەرەیدوون بەسەرچوو، کاتێ کە نیوەشەو یارە جوانە وەك مانگەکەی هاتە لای سەرینەکەی واتە ڕاسەری.

عـــــەزیزا مـــــەردی ئـــــەز نامـــــەرد نـــــایی
فـــــەغان و نالـــــە ئـــــەز بـــــێ دەرد نـــــایی
حەقیقـــەت بـــشنە و ئـــەز پـــووری فەرەیـــدوون
کـــە شـــوعلە ئـــەز تـــەنووری ســـەرد نـــایی

ئەم چوارینە لێکدراوەتەوە.

* * * *

**پووری فەرەیدوون لە کەشکۆڵی (تذکره مرآت الفصاحه)دا:**

(شیخ مفید داور) لە ساڵی ١٣١٦ك: لە کتێبەکەی خۆی (تذکره مرآت الفصاحه)دا لەبارەی پووری فەرەیدوونەوە دەڵێ: پووری فەرەیدوون شیرازی، پیاوێکی یەکتاپەرست بوو، بەڵام شیعری بە زمانی ڕازی وتووە، شێخ مفید دوو چوارینەی ئەوی پیشان داوە:

هـــــەر ئـــانکو لـــەعلی یـــارەش هـــالوو ئایـــە
دەمـــادەم بـــەر تەنـــەش جـــانی نـــەو ئایـــە
بەســـەر شـــود زوڵمـــەتی پـــووری فەرەیـــدوون
کـــە بـــەر بـــالین حـــوورەش نیمەشـــەو ئایـــە

* * * *

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە، بەڵام کەمێ جیاوازی هەیە لەنێوانیاندا، لەکۆتایی نیوە دێڕی یەکەم و دووەم و چوارەمدا (ئایە) هاتووە و لەوی تردا (ئامە) و هەردوو وشەکە یەك واتایان هەیە، لە نیوە دێڕی چوارەمدا

(حوورەش) هاتووە و لەوی تردا (مەهەش) هاتووە هەروەها (سەو) هاتووە و لەوی تردا (شەو) هاتووە دیارە ئەمەیان ڕاستترە.

عـــــەزیزا مـــــەردی ئـــــەز نامـــــەرد نـــــایی
فـــــەغان و نالــــــە ئـــــەز بــــی دەرد نـــــایی
حەقیقـــەت بـــشنە و ئـــەز پـــووری فەرەیـــدوون
کـــە شـــوعلە ئـــەز تـــەنووری ســـەرد نـــایی

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

**پووری فەرەیدوون لە (تذکرە روز روشن)دا:**

لە کەشکۆڵی تەزکەرەی رووزی رەوشەندا (محمد مظفر حسین صبا)، بەم جۆرەی نووسیوە: لە شاعیرە کۆنەکان و ئەربابی عیرفان و یەکتاپەرستی بووە، ئەم چوارینەیە هینی ئەوە:

عـــــەزیزا مـــــەردی ئـــــەز نامـــــەرد نـــــایی
فـــــەغان و نالــــــە ئـــــەز بــــی دەرد نـــــایی
حەقیقـــەت بـــشنە و ئـــەز پـــووری فەرەیـــدوون
کـــە شـــوعلە ئـــەز تـــەنووری ســـەرد نـــایی

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

**پووری فەرەیدوون لە (شکرستان)دا:**

(شعاع شیرازی) لە کەشکۆڵی (تذکره شکرستان)، پووری فەرەیدوونی بە شیرازی داناوە و دەڵێ کە شیعرەکانی بەشێوەی بابا تاهیری داناوە.

شوعاعی شیرازی چوار چوارینەی خستۆتە ڕوو کە دوانیان لە دەستنووسە کۆنەکاندا نەهاتوون و بەم جۆرەن:

بگـــوو پـــووری فەرەیـــدوون یـــارت ئامـــەد
درەختـــی ســـەبزی گەوهـــەر بـــارەت ئامـــەد
بـــدە ئـــەنگو شـــتەرەت را موژدەگـــانی
ڕەفیقـــی غـــەمخور و غـــەمخوارەت ئامـــەد

* * * *

واتە: بڵێ پووری فەرەیدوون یارت هات، درەختی سەوزی گەوهەر بارێنەرت هات، ئەنگوستیلەکەت بە مژدە بدە، دۆستی غەمخۆر و دڵسۆزت هات.

بـــەرادەر بـــا ڕەفیقـــی بـــەد مـــەکون خـــوو
بـــە حاجـــەت پیـــشی نامـــەردان مـــەکون ڕوو
حەقیقـــەت گویـــەدی پـــووری فەرەیـــدوون
گـــوڵی پەسمانـــدەیی کـــەس را مـــەکون بـــوو

* * * *

واتە: برادەر مەبە بە دۆستی هاوڕێی بەد، بۆ پێویستی ڕوو مەکەرە نامەردان، ڕاستت دەوێ پووری فەرەیدوون، گوڵی پاشماوەی کەس بۆن مەکە.

هـــەر ئـــانكو لـــەعلی یـــارەش بالـــەو ئامـــە
دەمـــادەم بـــەر تەنـــەش جـــانی نـــەو ئامـــە
بەســـەر شـــود زوڵمـــەتی پـــووری فەرەیـــدوون
کـــە دەر بـــالین مەهـــەش نیمەشـــەو ئامـــە

* * * *

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە، بەڵام لەنیوە دێڕی یەکەمدا (بالەو) هاتووە و لەوی تردا (هالوو) هاتووە.

عـــەزیزا مـــەردی ئـــەز نامـــەرد نـــایی
فـــەغان و نالـــە ئـــەز بـــی دەرد نـــایی
حەقیقـــەت بـــشنە و ئـــەز پـــووری فەرەیـــدوون
کـــە شـــوعلە ئـــەز تـــەنووری ســـەرد نـــایی

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

**پووری فەرەیدوون لە (تذکرە سرآمدان سخن)دا:**

یەکێ لە کەشکۆڵ نووسەکان بەناوی (حسین دانش) لە کتێبی (تذکرە سرآمدان سخن "بە زمانی تورکی") لەگەڵ لێکدانەوەیەکی کورت و، هەروەها پیشاندانی دوو چوارینەی ئەو :

هەر ئانکو لەعلی یارەش .... عەزیزا مەردی .... ئەو بە خەڵکی ڕەی داناوە.

**پووری فەرەیدوون لە (تاریخ نظم و نثر در زبان فارسی)دا:**

سەعیدی نەفیسی لە کتێبی مێژووی هۆنراو و پەخشان لە زمانی فارسیدا، تاکۆتایی سەدەی دەهـەمی کۆچـی دەڵـێ: پـووری فەرەیـدوون لـە شـاعیرانی کۆتایی سەدەی حەوتەم و سـەرەتای سـەدەی هەشـتەمی کۆچییەوە، یـەکێ بووە لە کوردەکانی فارس شیعرەکانی گەیشتۆتە دەستمان.

**پووری فەرەیدوون هاوشانی بابا تاهیر:**

جەلال هومایی پووری فەرەیـدوون بـە هاوشـانی بابـا تـاهیر نـاو دەبـات و دەڵێ: ئەو شاعیرانەی کە دوای ئیسلام، هەنـدێ جـار، یـان بـە زۆری شـیعری فەهلەویاتیان داناوە وەکو: بونداری رازی، بابا تاهیری هەمەدانی، رووزبەهانی شیرازی، پووری فەرەیدوون، محەمەد سۆفی مازنـدرانی، مـەحموودی قـاری و لە وێنەی ئەمانە دەتوانرێ پەیدا بکرێ.

**سەردەمی پووری فەرەیدوون:**

سـەعیدی نەفیـسی بـەهۆی پـشت بەسـتن بـە شـاعیرانێ کـە ناویـان بـە پێشگری (پوور) دەست پێـدەکات[٨]، دوانیـان بـەناوی پـوور بـەهای جـامی و پوور حەسـەنی ئیـسفەراینی بـووە و لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی حەوتـەمی کۆچی ژیاون، ئـەوە ڕادەگەیـەنێت کـە نـاوی ئـەو شـاعیرانەی کـە بـە وشـەی (پوور) دەست پێدەکات بەزۆری لە کۆتایی سەدەی حەوتـەم، یـان سـەرەتای سەدەی هەشتەم باوبووە، بـەگوێرەی ئەمـە ئـەو وای بـۆ دەچـێ کـە پـووری فەرەیدوون لە کۆتایی سەدەی حەوتەم و سەرەتای سەدەی هەشتەمی کۆچی ژیاوە.

**شوێنی ژیانی پووری فەرەیدوون:**

بەپێی ئەو سەرچاوانەی کە باسمان کرد پووری فەرەیدوون شیرازی و ڕازی و خەڵکی ڕەی بووە، بەڵام سەعیدی نەفیسی لەسەر بنچینەی نووسراوەکانی کتێبی (نظم گزیده)، پووری فەرەیدوونی داناوە بە یەکێ لە کوردەکانی فارس و دەڵێ: لەبەر ئەوەی کە ئەو لە نەژادی کورد بووە و لە سەردەمە کۆنەکاندا لە ناوچە جیاجیاکانی فارس و لەوانە بەشێ لە ناوچەی ئاباده و ئیزەد خواستی سەر بە شاری ئاباده و بەشێ لە ناوچەی شەبانکارە و هەندێکی تر لە دەوروبەری کرمان و شاری بابەك دەژیان، ناتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە پووری فەرەیدوون خەڵکی کام ناوچەی فارس بووە. بەڵام لە سەدەی هەشتەمدا بەشی زۆری کوردەکانی فارس نیشتەجێیی سەرووی ناوچەکانی ئەو سەرزەمینە بوون، کە لەنێوان ئاباده و ئیزەد خواست بوون و لە وانەیە کە پووری فەرەیدوونیش لەهەمان ناوچە ژیابێت.

بۆچوونەکەی سەعیدی نەفیسی لەبارەی شوێنی ژیانی پووری فەرەیدوون، جێگای باوەڕە، ئەوەی کە شوێنی ژیانی پووری فەرەیدوون دەسەلمێنێ ئەم چوارینەیە:

سفاهوونیم سفاهوونیم چە جایی
کە هەر یاری گرفتیم بی وەفا بی
شەویم یەکسەر بروونیم تا بە شیراز
کە دەر هەر مەنزلیم سەد ئاشنایی

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

دەبێ ئەوە بزانین کە پووری فەرەیدوون لە ئیسفەهانەوە تا شیراز، لەهەر مەنزڵێکدا (ماوەی مەنزل تا مەنزڵ ١٨–٢٤کم)ە، سەد ئاشنای هەبووە، گومانی تێدا نییە کە شوێنی ژیانی پووری فەرەیدوون لەناو هاونەژادە کوردەکانیدا بووە و هەمان ناوچەیە کە باسکرا.

مەسەلەیەکی تر کە ئەم تیوورییە بەهێز دەکات ئەم چوارینەی خوارەوەی پووری فەرەیدوونە:

مەرا دەرسەر نەسەودایی نەسوودی
نەدەر دل فکری بیهبوودی نە بوودی
نەخواهیم زیندە روود و باغ کاران
کە هەر چەشمیم هەزاران زیندە روودی

* * * *

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە و، ئەوەی کە جیاوازە نیوە دێڕی سێیەمە و لەوی تردا دەڵێ: (نەخواهیم جوکەنار و چەشمە ساران) واتە: کەناری جۆگەلە و سەرچاوەی ئاوەکانم ناوێ، بەلآم لەم چوارینەیەدا دەڵێ:

(نەخواهیم زیندە روود و باغ کاران) واتە ڕووباری زیندە روودو، باغ کارانم ناوێ. زیندە روود هەمان زایندە روودەو، (باغ کاران) باغێکی کۆن و دێرینی ئیسفەهان بووە، بەم پێیە دیارە کە پووری فەرەیدوون، ناوچە جوغرافیایەکانی دەوروپشتی خۆی ناسیوە و، گومانی تێدا نییە کە پووری فەرەیدوون شیعری تری هەبووە کە باسی ناوچەی جوغرافیایی کردووە، بەلآم ئێمە بێ ئاگاین لەو شیعرانە.

**پووری فەرەیدوون باوکی بابا تاهیر:**

بەگوێرەی ئەوەی کە باسکرا و، لەسەر بنچینەی ئەم هۆنراوانەی خوارەوە، هەندێ لە کەشکۆڵ نووسان وادەزانن کە پووری فەرەیدوون باوکی بابا تاهیر بووە:

عـــەزیزا مـــەردی ئـــەز نامـــەرد نـــایی
فـــەغان و نالـــە ئـــەز بێـــدەرد نـــایی

حەقیقـــەت بـــشنەو ئـــەز پـــووری فەرەیـــدوون
کـــە شـــوعلەی ئـــەز تـــەنووری ســـەرد نـــایی

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

بـــورە کـــەز دیـــدە جـــەیحوونی بـــسازیم
بـــورە لـــەیلی یـــو مـــەجنوونی بـــسازیم
فەرەیـــدوونی عـــەزیز ئـــەز دەســـتی مـــو رەفـــت
بـــورە ئـــەز نـــەو فەرەیـــدوونی بـــسازیم

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

لەو کەسانەی کە پووری فەرەیدوون بە باوکی بابا تاهیر دادەنێن (آقابزرگ طهرانی) خاوەنی (الذریعة)یە، کە لە بارەی دیوانی بابا تاهیرەوە دەڵێ:

"وهو بابا طاهر الهمداني ابن فريدون كما يظهر من شعر قال في (مع ص ٣٢٦) انه كان حياً في ٤١٠ وفي شاهد صادق انه مات ٤١٠..."

واتە: وە ئەوە بابا تاهیری هەمەدانی کوڕی فەرەیدوونە، کە لە شیعرەکانیدا دیارە (بڕوانە لاپەڕەی ٣٢٦)، ئەو لە ٤١٠ك لە ژیاندا بووە و بەڵگەی تەواو هەیە کە لە ٤١٠ك کۆچی دوایی کردووە.

یەکێکی تر کە لەپاش (آقابزرگ طهرانی) پووری فەرەیدوونی بە باوکی بابا تاهیر داناوە (وحید دەستـگردی)یە، کە لە چامەی "ابن سینا"دا، لەبارەی شاری هەمەدانەوە دەڵێ:

ای کـــــــــاخ ســـــــــــختوران دانــــــــــا
وی عـــــــرش کنـــــــوز علـــــــم بیـــــــچون
ای مـــــــدفن پـــــــاك ابـــــــن ســـــــینا
مـــــــسعود و بـــــــدیع ازتـــــــو پیـــــــدا
عـــــــین القـــــــضاة در تـــــــو مـــــــدفون

* * * *

واتە: ئەی کۆشکی قسەزان و شاعیرانی زانا، ئەی عەرشی خەزنەکانی زانستیی بێ وێنە (خوا)، ئەی شوێنی ئارامگای ئیبن سینا، وەی شوێنی لە دایك بوونی پووری فەرەیدوون، مەسعوود و بەدیع لە تۆوە پەیدابوون، عەینولقوزات لە تۆدا نێژرا.

دکتۆر جەواد مەقسود لە پەراوێزی ئەم شیعرەدا دەڵێ:

"مەبەست لە پووری فەرەیدوون بابا تاهیرە، چونکە بەپێی ئەوەی کە زانراوە، ناوی باوکی بابا، فەرەیدوون بووە".

م. ئەو رەنگ بەپێی چوارینەی:

عـــــــەزیزا مـــــــەردی ئـــــــەز نامـــــــەرد نـــــــایی
فـــــــەغان و نالـــــــە ئـــــــەز بـــــــی دەرد نـــــــایی

حەقیقـــەت بـــشنەو ئـــەز پـــووری فەرەیـــدوون
کـــە شـــوعلە ئـــەز تـــەنووری ســـەرد نـــایی

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

هەروەها ئەم چوارینەیەی تر:

بـــورە کـــەز دیـــدە جـــەیحوونی بـــسازیم
بـــورە لـــەیلی و مـــەجنوونی بـــسازیم
فەرەیـــدوونی عـــەزیز ئـــەز دەســـتی مـــو رەفـــت
بـــورە ئـــەز نـــەو فەرەیـــدوونی بـــسازیم

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

فەرەیدوون دادەنێ بە باوکی بابا تاهیر و لە چوارینەی دووەمدا گومان دەکات کە بابا تاهیر بەهۆی کۆچی دوایی باوکییەوە دایناوە.

بەم هەموو لێکدانەوەیە، تیووری هەمووان بەرپەرچ دەداتەوە.

**لێکۆڵینەوە لە شیعرەکانی پووری فەرەیدوون:**

بۆ لێکۆڵینەوەی تەواو و هەمەلایەنەی شیعرەکانی ئەم شاعیرە، پێویستمان بە دیوانەکەیەتی، کە تائێستا دیوانەکەی دەست نەکەوتووە و نەبینراوە، دووەم بێجگە لەو چوارینانەی کە لە لاپەڕەکانی پێشوودا خرانە

ڕوو، زۆر کەمە، شیعرەکانی تری ئەو نەبینراوە، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم چوارینانەی یەك جۆر و شێوە نین، لەلایەکی ترەوە لە وێنە و شێوەی چوارینەکانی بابا تاهیرە و، بەزۆری لە دیوانە چاپکراوەکانی بابا تاهیردا بەرچاو دەکەوێ، دەتوانرێ کە ئەو بە شاعیرێکی گومناو و هەڵدەر بەسەر زێدی خۆیدا دابنرێت.

بە هەموویەوە ٢١ چوارینەی پووری فەرەیدوون لە کەشکۆڵەکاندا هاتووە کە: عەزیزا مەردی.... ٧ جار و، هەر ئانکو لەعلەش ٤ جار دووبارە کراوەتەوە.

**شیعرەکانی پووری فەرەیدوون:**

بێجگە لەو چەند چوارینەی کە بەناوی پووری فەرەیدوونەوەیە و، لە دیوانە چاپکراوەکانی بابا تاهیردا نەهاتوون، لێکۆڵینەوە لەبارەیان بە سادەیی ئەنجام دەدرێت و، ژمارەیان ٩ چوارینەیە کە لەمەوپێش لێکدراونەتەوە و، یەك دێڕە شیعرە کە هینی پووری فەرەیدوون خۆیەتی.

ئەو چوارینانەی کە تایبەتن بە پووری فەرەیدوون ئەمانەی خوارەوەن کە هەموویانمان لێکداوەتەوە، تەنها دێڕە شیعرەکە نەبێ، کە لە هەموو کەشکۆڵ و چاپەکاندا تێکچوو شێوێندراوە و تائێستا بۆ کەس لێکنەدراوەتەوە:

عــــەزیزا رەخنــــە دەر ســــندان کونــــە د عیــــشق
مــــەرەس دەرگــــەردەنی شــــیران کونــــە د عیــــشق
گــــــــەدا و پادشــــــــا و مــــــــیر و دەرویــــــــش
هەمــە باخــاك و خــوون یەكــسان کونــە د عیــشق

* * * *

دلا تا مەن وە سەر داریم دەمی تە
نەداریم عالەمی جوز عالەمی تە
جیهان بشی و دل بشی و جان شی
نەشی نەشی ز دل شەوقی غەمی تە

* * * *

ز دیلم گەر سەبووری کەم نەبوودی
بە چەشمیم چەشمەی زەمزەم نەبودی
نەداریم غەم خوری کەز غەم فیگاریم
گەریم غەمخوارە بودی غەم نەبوودی

* * * *

دلا جوز شەوقی تو بازیم نەبازیم
بە جوز تو وا کەسی سازیم نەسازیم
تویی ناز و نیازی هەردو کەونیم
بەجوز وەسلت ز حەق خوازیم نەخوازیم

* * * *

درا ئەز گەردی گەردوون وا رەهانیم
دمی ئەز خاك و ئەز خوون وا رەهانیم
چ ئەم پیچیدەئی پووری فەرەیدوون
ئەزین پووری فەرەیدوون وا رەهانیم

* * * *

هەر ئەنکو لەعلی یارەش هالوو ئەمە
دەمادەم بەر تەنەش جانی نەو ئەمە
بەسەر شود زولمەتی پووری فەرەیدوون
کە دەر بالین مەهەش نیمە شەو ئەمە

* * * *

مخلف خالدار مو لو شكر و كفاخش
حاجت وصف بنده نی هركه خش مجاخش

* * * *

ئەگەر چون مووم سەد سوورەت پەزیریم
بە هەر سوورەت بە دل نەقشی تو گیریم
تو تا بەختی منی هەرگیز نەخوابیم
تو تا عومری منی هەرگیز نەمیریم

* * * *

بگو پووری فەرەیدوون یارەت ئامەد
درەختی سەبزی گەوهەر بارەت ئامەد
بدە ئەنگوشتەرەت را موژدەگانی
رەفیقی غەمخور و غەمخوارەت ئامەد

* * * *

بەرادەر بارەفیقی بەد مەکون خوو
بە حاجەت پیشی نامەردان مەکون روو
حەقیقەت گویەدی پووری فەرەیدوون
گولی پەس ماندەیی کەس را مەکون بوو

* * * *

**شیعرەکانی پووری فەرەیدوون لە دەستنووسەکانی بابا تاهیردا:**

بۆ دیاری کردنی خاوەنی ئەم جۆرە شیعرانە، پێویستە هەر چوارینەیەك بە جیا شی بکەینەوە، بەڵام لەپێش ئەوەی کە بچینە ناو باسەکەوە، دەبێ

که بەشی زۆری چوارینەکانی دەستنووسی (ملا عبدالصمد ساروی) که بەناوی پووری فەریدوونەوە هاتووە هینی بابا تاهیر بێ (م. اورنگ).

بەشێوەیەکی گشتی ١٦ چوارینەی پووری فەرەیدوون لە شیعرە چاپکراوەکانی بابا تاهیردا هاتووە.

**لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی شیعرەکانی پووری فەرەیدوون:**

ئێستا خەریکی لێکۆڵینەوەی چوارینەکانی دەبین.

**- ١ -**

عـــــەزیزا مـــــەردی ئـــــەز نامـــــەرد نـــــایی
فـــــەغان و نالــــــە ئـــــەز بـــــی دەرد نـــــایی
حەقیقـــەت بـــشنەو ئـــەز پـــووری فەرەیـــدوون
کـــە شـــوعلە ئـــەز تـــەنووری ســـەرد نـــایی

ئەم چوارینە لێکدراوەتەوە.

* * * *

بەگوێرەی وردبوونەوەی م. ئەورەنگ، ئەم چوارینەیە لە ١١ دەستنووسی بابا تاهیردا هاتووە، کە یەکەمیان دەستنووسی ژمارە (٩١٩٢)ی کتێبخانەی ئەنجومەنی شوورای ئیسلامی (ژمارە یەك)ە، کە لە ساڵی (١٢٢٢ك)دا نووسراوە.

ئەم چوارینەیە لە شەش دەستنووسدا بەناوی پووری فەرەیدوون هاتووە و، لە چوار دەستنووسدا بەناوی قەلەندەر، بەڵام لەبەر ئەوەی کە لە کتێبی (نظم گزیدە)دا بەناوی پووری فەرەیدوونەوە هاتووە، ئەمە دادەنێین بە بەشێ لە شیعرەکانی پووری فەرەیدوون، دکتۆر خانلەریش ئەمەی بە هینی پووری فەرەیدوون داناوە.

- ٢ -

بـــــوره كـــــەز ديـــــده جـــــەيحوونى بـــــسازيم
بـــــوره لـــــەيلى و مـــــەجنوونى بـــــسازيم
فەرەيـــدوونى عـــەزيز ئـــەز دەســـتى مـــو رەفـــت
بـــــوره ئـــــەز نـــــەو فەرەيـــــدوونى بـــــسازيم

ئەم چوارينەيە لێكدراوەتەوە.

* * * *

سەعيدى نەفيسى وا دەزانێ كە لە نيوە بەيتى چوارەمدا دەستكارييەك ڕووى داوە و، دەڵێ: لەوانەيە خۆى بەم جۆرە بێت: ((بوره پوورى فەرەيدوونى بسازيم)) ئينجا دەڵێت: نووسەرى دەستنووسەكان ((پوورى فەرەيدوون))يان گۆڕيوە بە ((نەو فەرەيدوون)).

لە دەستنووسەكەى (ملا عبدالصمد ساروى) بەناوى پوورى فەرەيدوون هاتووە و دكتۆر خانلەرى و سەعيدى نەفيسى و م. ئەورەنگ، ئەم چوارينەيە بە هينى پوورى فەرەيدوون دادەنێن، ئيتر لەم بارەيەوە و شتێكى ترمان نييە.

- ٣ -

ســــــــفاهوونيم ســــــــفاهوونيم چ جــــــــايى
كـــــە هـــــەر يـــــارى گـــــرفتم بـــــى وەفـــــابى
شـــــەويم يەكـــــسەر بـــــروونيم تـــــا بـــــە شـــــيراز
كـــــە دەر هـــــەر مـــــەنزليم ســـــەد ئاشـــــنايى

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

لەگەڵ ئەوەی کە تەنها لەناو دوو دەستنووسدا ئەم چوارینەیەبەناوی بابا تاهیر هاتووە، گومانی تێدا نییە کە ئەم چوارینەیە هینی پووری فەرەیدوونە، کە سنووری ناوچەی ژیانی پووری فەرەیدوونمان بەم چوارینەیە دیاری کردووە، کە بەڵگەی شارەزایی بابا تاهیرمان بە دەستەوە نییە بۆ ئەم ناوچەیە.

ـ ٤ ـ

ئەگـــەر چـــون مـــووم ســـەد ســـوورەت پـــەزیریم
بـــە هـــەر ســـوورەت بـــە دل نەقـــشی تـــو گیریـــم
تـــــو تـــــا بـــــەختی منـــــی هـــــەرگیز نـــــەخوابیم
تـــــو تـــــا عـــــومری منـــــی هـــــەرگیز نـــــەمیریم

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

دکتۆر خانلەری دەڵێ: ئەم چوارینەیە هینی بابا تاهیر نییە و، ناوی خاوەنەکەیشی نەهێناوە.

لەبەر ئەوەی کە ئەم چوارینەیە لە هەموو دەستنووس و چاپەکاندا بەناوی بابا تاهیرەوە نەهاتووە، بە هینی پووری فەرەیدوونی دادەنێین. (م. ئەورەنگ)

- ٥ -

عاشـــق ئـــون بـــی کـــه دایـــم دەر بـــەلا بـــی
ئـــەیووب ئاســـا بـــە کرمـــوون مومبتـــەلا بـــی
حەســـەن ئاســـا بنووشـــە کاســـەیی زەهـــر
حـــسین ئاســـا شـــەهیدی کەربـــەلا بـــی

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

ئەم چوارینەیە لە ١٧ دەستنووسدا بەناوی بابا تاهیرەوە هاتووە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە دەستنووسی (ملا عبدالصمد ساروی) بەناوی پووری فەرەیدوونەوە هاتووە، ئەمە دادەنێین بە یەکێ لە چوارینەکانی پووری فەرەیدوون. (دکتۆر خانلەری)

- ٦ -

زخـــوور ئـــین چـــیهرە ئـــەت ئەفرووتـــە تـــەر بـــی
تـــیری عیـــشقت بـــە جـــانیم دووتـــە تـــەر بـــی
مـــەرا ئەختـــەر بـــووەد خـــالی ســـیاهەت
زمـــو یـــارا کـــە ئەختـــە ســـووتە تـــەر بـــی

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

ئەم چوارینەیە لە ١٣ دەستنووسی جۆراوجۆردا بەناوی بابا تاهیرەوە هاتووە، لەبەر ئەوەی دەستنووسی (ملا عبدالصمد ساروی) بە هینی پووری

فەرەیدوونی دادەنێت، ئێمەیش بە بەشێکی دادەنێین لە شیعرەکانی پووری فەرەیدوون. (دکتۆر خانلەری)

ـ ٧ ـ

مــــورا نـــــه فکـــــری ســــەودائی نـــــه ســــوودی
نـــــه دەر دل فکـــــری بیهبـــــوودی نـــــه بـــــوودی
نـــــه خـــــواهیم جووکـــــەنار و چـــــەشمه ســــاران
کـــــه هـــــەر چـــــەشمیم هـــــەزاران زینـــــده روودی

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

لە ١٧ دەستنووسدا ئەم چوارینەیە بەناوی بابا تاهیرەوە هاتووە و بەهیچ جۆرێ ناوی پووری فەرەیدوون نەبراوە. ئەڵبەتە م. ئەورەنگ ئەم چوارینەیەی بەم جۆرە هێناوە:

مـــــەرا دەرســـــەر نەســـــەودایی نەســـــوودی
نـــــەدەر دل فکـــــری بیهبـــــوودی نـــــه بـــــوودی
نـــــەخواهیم زینـــــده روود و بـــــاغ کـــــاران
کـــــه هـــــەر چـــــەشمیم هـــــەزاران زینـــــده روودی

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

لەگەڵ ئەوەشدا لێکۆڵەری ناوبراو دەڵێ کە باغ کاران، باغێکی کۆن بووە لە ئیسفەهاندا، لەبەر ئەوەی کە نووسەری دەستنووسەکان ئاگایان لەمە نەبووە، ئەوەیان گۆڕیوە. (خانلەری)

دکتۆر خانلەری وا دەزانێ کە خاوەنی ئەم چوارینەیە ئیسفەهانی بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە لە هەموو چوارینەکانی بابا تاهیردا ناونیشان و شوێنی باس ناکات، بە بۆچوونی نووسەری ئەم وتارە و بەگوێرەی چوارینەی ((سفاهوونیم سفاهوونیم))، دەبێ ئەم چوارینەیە هینی پووری فەرەیدوون بێت.

**چوارینەکانی بابا تاهیر:**

لەپاش جیاکردنەوەی شیعرەکانی پووری فەرەیدوون، چوارینەکانی تر هینی بابا تاهیرن:

**- ١ -**

مـــو ئـــەز قـــالوو بـــەلا تەشـــویش دیـــریم

گونـــەه ئـــەز بـــەرگ و بـــاران بـــیش دیـــریم

چـــو فـــەردا نوومـــە خوونـــوون نوومـــە خوونـــەن

مـــو دەرکـــەف نوومـــە ســـەر دەرپـــیش دیـــریم

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

لەگەڵ ئەوەی کە ئاوازی چوارینەکە بەشێوەی بابا تاهیرە و لە ٣٧ دەستنووسدا بەناوی ئەوەوە نووسراوە و هەروەها کۆنەیی دێڕە شیعری

یەکەم بێگومانمان دەکات، کە خاوەنی ئەم چوارینەیە بابا تاهیرە. (م. ئەورەنگ)، دکتۆر خانلەریش ئەوەی بە هینی بابا تاهیر داناوە.

ـ ٢ ـ

ئەگـــەر مەســـتانی مەســـتیم ئـــەز تـــە ئیمـــان
وەگـــەر بـــی پـــاو دەســـتیم ئـــەز تـــە ئیمـــان
ئەگـــــەر گـــــەوریم و تەرســــا وەر موســــولمان
بــە هــەر میللــەت کــە هەســتیم ئــەز تــە ئیمــان

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

ئەم چوارینەیە بەناوی بابا تاهیرەوە نووسراوە و لە کۆنترین کەشکۆڵی کتێبخانەی (مجلس شورای اسلامی) لەژێر ژمارەی (١٠٩٧) دایە، کە لە ساڵی (٩٣٠ك) نووسراوە و بەناوی بابا تاهیرەوەیە.

ـ ٣ ـ

خوشــــا ئانــــان کــــە ئــــەڵلا یارشــــون بــــی
بــــە حەمــــد و قــــول هــــووەڵلا کارشــــون بــــی
خوشــــا ئانــــان کــــە دایــــم دەر نــــەمازەن
بەهەشــــــتی جاویــــــدان بازارشــــــون بــــــی

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

لە هەمان کەشکۆڵدا نووسراوە، لە ساڵی (٩٣٠ك)، لەژێر ژمارەی (١٠٩٧) کتێبخانەی (مجلس شورای اسلامی) ژمارەیەك، بەناوی بابا تاهیرەوە هاتووە. (ئەورەنگ)

ـ ٤ ـ

کوشـــیمان گـــەر بـــەزاری ئـــەزکی تەرســـی
بروونـــی گـــەر بـــە خـــواری ئـــەزکی تەرســـی
بـــە ئـــین نیمـــە دل ئـــەز کـــەس مـــو نەتەرســـیم
دو عالـــەم دل تـــە داری ئـــەز کـــی تەرســـی

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

ئەم چوارینەیە لە کەشکۆڵێك، لە ساڵی (١٢٦٠ك)دا نووسراوە و بە ناوی بابا تاهیرەوە هاتووە. (ئەورەنگ)

لە کتێبی (المعجم فی معاییر اشعار العجم)، نووسینی محەمەد شەمسەددین قەیسی ڕازی، کە هینی سەدەی حەوتەمی کۆچییە، چەند تەرانەیەکی لە فەهلەوییات هێناوەتەوە و، دەڵێ بە زمانی خەڵکی هەمەدانە، هەرچەندە لەم کتێبە ناودارەدا، ناوی بابا تاهیر نەهاتووە، بە تەواوی دیارە کەشیعرەکانی بابا تاهیرە، هەروەها دکتۆر خانلەری ئەمانەی بە چوارینەکانی بابا تاهیر داناوە.

ـ ٥ ـ

بـــە ئـــین بـــی ئاشـــنایی بـــەر کیـــان شـــیم
بـــە ئـــین بـــی خانومـــانی بـــەر کیـــان شـــیم

هەمـــە گـــەر مـــو بروونـــەن واتـــە ئـــایم

تـــە ئـــەز دەرگـــەر بروونـــی وا کیـــان شـــیم

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

ئەم چوارینەیە لە ٤٠ دەستنووسدا، کە یەکێ لەوانە لە کەشکۆڵی ژمارەی (١٠٩٧)ی ساڵی (٩٣٠ك)دا، بەناوی بابا تاهیرەوە هاتووە.

- ٦ -

بـــوره ســـووته دلان تـــا مـــا بنـــالیم

بیـــا پەروانـــە بامـــا تـــا بنـــالیم

ز عیـــشقی ئـــان گـــولی ڕەعنـــا بنـــالیم

ز دەســـتی یـــاری بـــی پـــەروا بنـــالیم

ئەم چوارینەیە لێکدراوەتەوە.

* * * *

ئەم چوارینەیەیش لە ٤٠ دەستنووسدا هاتووە، کە یەکێ لەوانە کەشکۆڵی ژمارەی (١٠٩٧)ی کتێبخانەی شوورای ئیسلامی (ژمارە یەك) بەناوی بابا تاهیرەوە نووسراوە. (ئەورەنگ)

گومانی تێدا نییە و لەوانەیە کە گەلێ دەستنووسی تر لە گۆشەی کتێبخانەکاندا هەبن، کە ڕازی گەلێ لەو نەزانراوانە ڕوون بکاتەوە.

* * * *

## فەرهەنگۆك

* **ئاسا:** وەك، وەكو.
* **ئانان:** ئەوان.
* **ئانكو:** ئەوەی كە، یان ئەو كەسەی كە، وشەكە دوو بەشە:
ئان + كو
ئان: ئەوە.
كو: كە، یان كە ئەو.
* **ئایم:** دێم.
* **ئایە:** دێت.
* **ئوون:** ئەوە.
* **ئەختەر:** ئەستێرە.
* **ئەز:** لە.
* **ئەزین:** كورتكراوەی ئەزئین، واتە: لە ئەمە، لەمە.
* **ئەفرووتە:** داگیرساو، هەڵگیرساو، درەخشان.
* **ئەمە:** دێت.
* **ئەیووب:** یەكێكە لە پێغەمبەرەكانی بەنی ئیسرائیل، كە لە قورئانی پیرۆزدا، چوار جار ناوی براوە. لە تەوراتدا بەشێك تایبەتە بە داستانی ئەو.

خوا ئەیووبی گیرۆدەی دەردێ كرد، تاقی بكاتەوە، لەپێشدا دەست كورت و هەژاری كرد، ئینجا مناڵەكانی مراند، ئەویشی بە سەختی نەخۆش كرد، بەڵام ئەیووب بەرگەی ئەم هەمووەی گرت و

نەینالاَند، هەر لەبەر ئەمە ناسرا بە ڕەنج و سەختیی و سەبری ئەیووب.

لە سوورەی (ص) ٣٨، ئایەی ٤٤ دەفەرمووێ: ((إنا وجدناه صابراً))، واتە: ئەومان بینی بە سەبر و ئارامی.

دەڵێن هەموو لەشی کرمی تێ دا.[٩]

* **ئین**: ئەمە.
* **با**: لەگەڵ.
* **بازارشون**: مەبەست شوێنیانە، جێگایانە. بەلاَم واتە: بازاڕیانە.
* **بازیم**: لێرەدا واتە سەرگەرمم.
* **باغ کاران**: باغێکی کۆن و دێرینی شاری ئیسفەهانە. لە کەناری رووباری زایندە روود، بەناوبانگ بووە بە جوانی، ئێستاش پاشماوەکەی ماوە.[١٠]
* **بالین**: سەرین، بالیف.
* **بروونەن**: دەربکەن، دووربکەنەوە، لێ بخوڕن.
* **برونی**: دەربکەیت، دووری بکەیتەوە.
* **بروونیم**: دەڕۆم، ڕەوانە دەبم، دەری دەکەم، دووری دەخەمەوە، لێی دەخوڕم.
* **بسازیم**: ساز بکەم، دروست بکەم.
* **بشنەو**: ببیستە، گوێت لێبێت.
* **بشی**: دەڕوات، دەچێت.
* **بنالیم**: بناڵێنین.
* **بورە**: وەرە.

* **بوود**: بوو.

* **بووەد**: دەبێت.

* **بە جوز**: بێجگە لە.

* **بەرکیان شیم**: بۆ لای چ کەسانیٚ برۆم، یان لای چ کەسانیٚ بم.

بەر: لا.

کیان: چ کەسانیٚ، وشەکە دوو بەشە: کی + یان.

کی: کیٚ، ئامرازی پرسیارە.

ان: ئامرازی کۆ.

ئەمڕۆ لە کوردیدا ناوتریٚ (کێیان، کیٚ یەکان) بەڵکو دەوتریٚ چ کەسانیٚ.

* **بەرگ**: گەڵای دار.

* **بەسەر شود**: بەسەرچوو، کۆتایی هات، تەواو بوو.

* **بی**: بوو.

* **بیا**: وەرە.

* **بیش**: زۆر، گەلیٚ.

* **بیهبوود**: چاك بوونەوە لە نەخۆشی، تەندروستی، لەش ساغی.

* **پەروا**: ترس، باك، هەراس.

* **تە**: تۆ.

* **تەر**: تر، وەکو دەڵێن سووتە تەر، واتە سووتاوتر.

* **تەرسا**: مەسیحی، نەسرانی، پەیڕەوی ئایینی عیسا.

* **تەشویش**: تشویش ـ ع ـ پەشێوی و نائارامی، ترس و نیگەرانی، پەرێشانی، شێوان.

* **تەنەش**: لەشی، تەنی، لەشی ئەو.
تەن: لەش.
ش: جێناوە بە واتای ئەو، هینی ئەو.

* **جا**: جیێ، جێگە، جێگا، شوێن.

* **جان**: گیان.

* **جاویدان**: هەمیشەیی، نەمری.

* **جوز**: بێجگە لە.

* **جوو کەنار**: کەناری جوو، کەناری جۆگەلە.

* **جەیحوون**: ڕووباری بەلخ کە لە خوارەزم کۆتایی دێت. (منتهی الارب) ئامووبە، ئاوێکە لەناوەڕاستی خوراسان و ماوەرائەننەهر نزیکی بەلخ. (آنندراج).
ڕووبارێکی گەورەی تورکستانە، کە سەرچاوەکەی لە دەشتاییە بەرزەکانی پامیرە، لەپاش ئاودانی (خیوە) دەڕژێتە دەریای ئارال.
ڕووبارێکە لە ئاسیای بچووك و ناوی کۆنی ئەم ڕووبارە (پیراموس) بووە، ئەمە جیاوازە لە جەیحوونی ئاسیا. [١١]

* **چ ئەم پیچیدەئی**: چیت تیێ پێچاوم، بیانووی چیم پێدەگریت.

* **چو**: کاتیێ.

* **چەشم**: چاو.

* **چەشمە**: سەرچاوە، کانی.

* **چەشمەسار**: شوێنیێ کە سەرچاوەی ئاوی زۆری تێدا بێت.
چەشمە: سەرچاوە.

سار: پاشگرە بە مەبەستی شوێن.

* **چێهر**: دەموچاو، ڕوو.

* **حوور**: حور - ع - کۆی (احور، حوراء)ی عەرەبییە، ژنانی جوانی بەهەشتیی. ئەوانەی کە چاویان ڕەش و جوانە. لە کوردیدا هەمان وشە بووە بە (حوری)، کە بۆ تاك بەکاردێت، واتە ژنی جوانی بەهەشتیی.

* **حەق**: خودا، یەزدان.

* **خاك**: مەبەست ناخۆشی و دەردی سەرییە.

* **خانومان**: ماڵ و حاڵ، شوێنی ژیان، ماڵ ئەوەی کە تیایدایە.

* **خوار**: بێ نرخ، بێ مایە، هیچ و پووچ.

* **خوازیم**: دەخوازم، دەمەوێت.

* **خوشا**: چەند خۆشە، بۆ دەربڕینی خۆشحاڵی و دڵخۆشی بەهۆی ڕووداوێکی خۆشەوە بەکاردێت.

* **خوور**: خۆر، هەتاو، ڕۆژ.

* **خوون**: مەبەست غەم و خەفەتە، خوێن.

* **داری**: هەتە.

* **دلا**: ئەی دڵ.

* **دوو عالەم دڵ**: دڵی دوو عالەم، دڵی دوو جیهان، دڵی ئەوانەی کە ئەمڕۆ هەن و ئەوانەی ئەو دنیایش.

* **دەر**: لە.

* **دەر**: دەرگا.

* **درا**: گەلێ واتای هەیە: وەرە ژوور، وەرە دەر، بەڵام مەبەست هاتنە لایە.

* **دەر نەمازەن**: خەریکی نوێژن.
نەماز: نوێژ.
* **دەم**: گەلێ واتای هەیە وەك: کات، هەناسە، کەنار، بەڵام بە واتای ناز و خۆشەویستیی و ئەفسوونە.
* **دەمادەم**: دەماودەم، جارە ناجار.
* **دیریم**: هەمە.
* **دیل**: دل، دڵ.
* **ڕووتە**: کاریگەر، تاڵان کراو، ماڵڕاو، پاك کراوە، گسك لێدراو.
* **ڕەخنە**: کون، درز.
* **ڕەعنا**: جوان، دڵڕفێن، هەروەها بە واتای نەزان، لەخۆبایی بوو بەهۆی جوانی یان دەوڵەمەندییەوە، گوڵێ کە لە ناوەوە سوورە و لە دەرەوە زەردە، دوو ڕوو.[١٢]
* **ڕەفت**: ڕۆیشت، چوو.
* **ڕەهـ**: کورتکراوەی (راه)ە، واتە ڕێگا، ڕێگە، ڕێ.
* **ز**: ژ، لە.
* **زار**: پەرێشان، شێواو، لاواز، لەڕ، نالە، ناخۆشی و دەردی سەری.
* **زەمزەم**: ناوی بیرێکە لە مەککە، نزیك کەعبە.
* **زیندە روود**: ڕووبارێکی بەناوبانگی ئیسفەهانە. (آنندراج) و (انجمن آرا).
ناوی ڕووبارێکی ئیسفەهانە (غیاث).[١٣]
* **سازیم**: بسازم.

* **سفاهوون**: صفاهون، اصفهان، ئیسفەهان، ئیسپاهان، ئیسپەهان، کراو بە عەرەبییەکەی اصباهان، اصبهان، ناوەندی پارێزگای دەهەم، لە ساڵی (١٠٠٦ك)دا شا عەبباسی یەکەم کردی بە پایتەخت، شارێکی گەورەیە لە ناوەڕاستی ئێراندا، لەدوای تاران گەورەترین شاری ئێرانە، لە سەردەمی سەفەوییەکاندا گەلێ باڵەخانەی تێدا دروست کرا، بە جۆرێ ئاوەدان بوو ناویان نا نیوەی جیهان (نصف جهان)، لە شوێنەواری مێژووییدا بەناوبانگترین شاری ئێرانە.[١٤]

* **سووتە**: سووتاو.

* **سەد سوورەت پەزیریم**: بە سەد جۆر دەگۆرێم.

پەزیریم: پەزیرەم، قبووڵ دەکەم، بەڵام لێرەدا واتە دەگۆڕێم.

* **سەر دەر پیش دیریم**: سەردادەنەوێنم، سەرم شۆڕ دەکەم.

* **سیاه**: سیا، ڕەش.

* **سیندان**: پارچە ئاسنێکی قورس و پانە، کە ئاسنی سوورەوە کراوەی لەسەر چەکوش کاری دەکرێ، بۆ ئەوەی وەکو چۆنیان بوێت وێنەکەی بگۆڕن، سندانی ئاسنگەری. (وشەکە لە بنەڕەتدا سوریانییە)[١٥]

* **شەوق**: ئارەزوو.

* **شەویم**: دەڕۆم، دەبم.

* **شی**: دەڕوات، دەچێت.

* **شیم**: بچم، بڕۆم.
* **عەزیزا**: ئەی خۆشەویست.
* **فەردا**: بەیانی، سبەی.
* **فەغان**: گریان و ناڵە.
* **فیگاریم**: زامدارم، بریندارم، غەمگینم، ڕەنجەڕۆم.
* **قالوو بەلا**: قالوا بلی. ئەمە ئیشارەتە بۆ ئایەی:

((وإذ اخذ ربك من بني آدم من ظهورهم ذريتهم واشهدهم على انفسهم الست بربكم قالوا بلى شهدنا ان تقولوا يوم القيمة إنا كنا عن هذا غافلين)) سوورەی اعراف (٧) ئایەی ١٧٢.

واتە: (ئەی پێغەمبەر ((د.خ))) لە بیرت بێ کاتێ خوای تۆ، لە پشتی فەرزەندانی ئادەم نەژادیانی دروست کرد، خوای تۆ ئەوانی کرد بە گەواه (شاهید) لەسەر خۆیان (بەم هۆیەوە بەڵگەی لەسەریان تەواو کرد و وتی) ئایا ئێمە لەسەر ئەوە شاهیدین (خوا ئەم کارەی کرد) بۆ ئەوەی ڕۆژی قیامەت ئێوە (ئەی وەچەی ئادەم) نەڵێن کە ئێمە لەم بڕیارە بێ ئاگاین.

* **کارشان**: کاریان.
* **کرموون**: کرمەکان.
* **کوشیمان**: دەمان کوژی.
* **کونەد**: دەکات.
* **کەز**: کورتکراوەی (کە ئەز = کەان) واتە کە لە.

* **کەف**: ناو لەپ، مەبەست دەستە.
* **گرفتیم**: گرتم.
* **گونەهـ**: کورتکراوەی گوناهـ، کردەوەیەك یان کارێك کە پێچەوانەی یاساکانی ئاین بێت، سەرپێچی لە کاروباری میری و کۆمەڵایەتی و ڕەوشت....
* **گەدا**: سواڵکەر.
* **گەرد**: تۆز، بەلاّم مەبەست غەم و ناخۆشییە.
* **گەردوون**: ڕۆژگار.
* **گەریم**: کورتکراوەی ئەگەریم، واتە ئەگەر من.
* **گەور**: گەبر، گەڵی واتای هەیە: گاور، زەردەشتی، بێ دین.
* **گیریم**: دەگرم.
* **لەعل**: مەبەست دەمولێوی سوور و جوانە، جۆرە بەردێکی بە نرخی سوورە، سوور، شەرابی سوور.
* **ما**: مە، ئێمە.
* **مو**: من.
* **مووم**: مۆم.
* **مەرا**: کورتکراوەی مەن را، واتە من لە حاڵەتی کارلێکراویدا.
* **مەرەس**: گوریس، پەت، ئەو قایش و پەتەی کە دەکرێتە ملی سەگ و شێر.
* **مەنزل**: منزل ـ ع ـ مەنزڵ، قۆناغ، جێگای نیشتەجێ بوون، ئەو شوێنەی کە بۆ ماوەیەکی کەم تیایدا دەمێننەوە.

* **مەهەش** : مانگەکەی، مەبەست یارەکەی.

* **نوومە**: نامە.

* **نوومە خوونوون**: نامە خوێنان، ئەوانەی کە نامە دەخوێننەوە.

* **نوومە خوونەن**: نامە دەخوێنن.

* **نەخوابیم**: نانووم، ناخەوم.

* **نەخواهیم**: نامەوێت.

* **نەداریم**: نیمە.

* **نەشی**: ناڕوات، ناچێت.

* **نەماز**: نوێژ.

* **نەمیریم**: نامرم.

* **نەو**: نوێ.

* **نیمە**: نیوە.

* **واتە**: لەگەڵ تۆ.

وا: لەگەڵ.

تە: تۆ.

* **وارەهانیم**: ڕزگارم بکە.

* **وەسەر داریم**: لەسەرمدایە، لەبیرمدایە، لە هۆشمدایە.

* **وەگەر**: کورتکراوەی وە ئەگەر.

* **هالوو**: ئادەمیزادی سادە و نەزان، گەوج و بێ ئاگا، هەروەها ئەم وشەیە لە لوڕستاندا لەپێشی ناوەوە دێت، وەکو هالوو ئیسماعیل، لەوە دەچێ کە فۆرمێکی تر بێت لە وشەی (خالو) بە واتای خاڵۆ.[١٦]

هالوو: ساده، خۆش باوەڕ، نەزان.[17]

هالوو: ئەم وشەیە لوڕییە واتە خالۆ، خۆش باوەڕ، نەزان، بیٚ ئاگا.[18]

* **هەردو کەون**: مەبەست هەردوو دنیایە، ئەم دنیا و ئەو دنیا، ئەم جیهانە و جیهانی بەرین.

* **هەمە**: هەموو، گشت.

* **یارشان**: یاریان.

* * * *

## پەراوێزەکان

١ـ بڕوانە: کردان پارس و کرمان ـ دکتر جمشید صداقت کیش ـ انتشارات صلاح الدین ایوبی ـ ارومیه ـ چاپ اول ـ سال ١٣٨١. ص ٩٩ ـ ١١٦.

٢ـ بابا طاهر نامه ـ هفده گفتار و گزینەی اشعار ـ تدوین: پرویز اذکایی ـ چاپ نخست ١٣٧٥ ـ انتشارات توس ـ ص ١٠٣.

٣ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل١٠٣ـ ل١٠٤.

٤ـ بابا طاهر نامه ـ ص ١٠١ ـ ص١٠٢.

٥ـ فارس: مەبەست خوارووی ئێرانە.

٦ـ کردان پارس و کرمان ـ ل ١٠١ ـ چوارینەی سێیەم نووسراوە (سرم)، ڕاستترە کە بنووسرێ (سەر).

٧ـ رازی: گوندێکە لە گوندەکانی (قطور)ی سەر بە شاری (خووی) و دەکەوێتە (٥٧) هەزار گەزی خۆرئاوای خووی و لە شوێنێکی کوێستانییە، دانیشتوانی سوننی و کوردن، بە کشتوکاڵەوە خەریکن.

هەروەها دەڵێ: سەر (ڕەی)یە "منتهی الارب"، ئەم وشەیە دراوەتە پاڵ قەومی ڕاز کە نیشتەجێی رەی بوون (رەی)ش ناوی شارێکە لە عیراقی عەجەم، یەکێکە لە شارە گەورەکانی (دەیلەم) نێوان (قوومس و جبال). (لغت نامه ـ تالیف: علی اکبر دهخدا ـ زیر نظر دکتر محمد معین ـ تهران ـ ١٣٣٧ ـ ١٣٤٦.

٨ـ بەم پێیە دەبێ بە (پوور فەرەیدوون) بخوێنرێتەوە.

٩ـ فرهنگ تلمیحات ـ دکتر سیروس شمیشا ـ انتشارات فردوس ـ چاپ ششم ـ تهران ١٣٨٧.

۱۰ـ فرهنگ فارسی ـ دکتر محمد معین ـ مؤسسه‌ی انتشارات امیر کبیر ـ تهران ۱۳۷۵ ـ شش جلدی.
۱۱ـ لغت نامه‌ی دهخدا.
۱۲ـ فرهنگ بزرگ سخن ـ ۸ جلدی ـ دکتر حسن انوری ـ چاپ دوم ۱۳۸۲ ـ چاپخانه‌ی مهارت ـ انتشارات سخن.
۱۳ـ لغت نامه‌ی دهخدا.
۱٤ـ فرهنگ فارسی ـ دکتر محمد معین.
۱۵ـ فرهنگ بزرگ سخن ـ دکتر حسن انوری.
۱٦ـ فرهنگ لغات عامیانه ـ سید محمد علی جمال زاده ـ به کوشش محمد جعفر محجوب ـ کتابخانه‌ی ابن سینا ـ تهران ـ ۱۳٤۱.
۱۷ـ پس کوچه‌های فرهنگ ـ محب. أ... پرچمی ـ انتشارات فرهنگ ماهرخ ـ چاپ اول ـ ۱۳۸۲.
۱۸ـ فرهنگ فارسی ـ دکتر محمد معین.

● * * *

## سەرچاوەكان


١ـ بابا طاهر نامه ـ هفده گفتار و گزینه‌ی اشعار ـ تدوین: پرویز اذكایی ـ چاپ نحست ١٣٧٥ ـ انتشارات توس.

٢ـ پس كوچه‌های فرهنگ ـ محب. أ... پرچمی ـ انتشارات فرهنگ ماهرخ ـ چاپ اول ـ ١٣٨٢.

٣ـ فرهنگ بزرگ سخن ـ ٨ جلدی ـ دكتر حسن انوری ـ چاپ دوم ١٣٨٢ ـ چاپخانه‌ی مهارت ـ انتشارات سخن.

٤ـ فرهنگ تلمیحات ـ دكتر سیروس شمیشا ـ انتشارات فردوس ـ چاپ ششم ـ تهران ١٣٨٧.

٥ـ فرهنگ فارسی ـ دكتر محمد معین ـ مؤسسه‌ی انتشارات امیر كبیر ـ تهران ١٣٧٥ ـ شش جلدی.

٦ـ فرهنگ لغات عامیانه ـ سید محمد علی جمال زاده ـ به كوشش محمد جعفر محجوب ـ كتابخانه‌ی ابن سینا ـ تهران ١٣٤١.

٧ـ كردان پارس و كرمان ـ دكتر جمشید صداقت كیش ـ انتشارات صلاح الدین ایوبی ـ ارومیه ـ چاپ اول ـ سال ١٣٨١.

٨ـ لغت نامه ـ تالیف علی اكبر دهخدا ـ زیر نظر دكتر محمد معین ـ تهران ١٣٣٧ ـ ١٣٤٦.


* * * *

# ملخص البحث

## پوري فريدون

**د. محمد نوري**

يعد پوري فريدون من شعراء الكرد الذين عاشوا في نهاية القرن السابع وبداية القرن الثامن الهجري (١٣-١٤ ميلادي)، وقد عثرت على اشعاره في نصوص رباعيات الشاعر المطبوعة بابا طاهر العريان.

وإن فكرة هذا البحث قد تبلورت أساساً نتيجة قراءة البحث الذي قدمه الدكتور جمشيد صداقت كيش في مؤتمر احياء ذكرى بابا طاهر العريان في همدان، ومن ثم نشره في كتاب تحت اسم (كردان پارس و كرمان) حيث قام الباحث بترجمتها من الفارسية الى الكردية مع كتابة المقدمة وتحويل الرباعيات الى الاملاء الكردي الحالي وثم شرحها فضلاً عن كتابة معجم بالمفردات اللغوية مع وضع الهوامش لها.

## Abstract

## Puri Fraidun

**Dr. Mohammed Nuri**

Puri Fraidun is regarded as a poet of the end of seventeeth and the beginning of eighteenth century. I have come across his poem through Baba Tahir Urian's quatrains.

The conception of this study has emerged during my perusal of Dr. Jimshid Sadaqat Kish's research adduced at the conference held in commemoration of Baba Tahir Urian in Hamadan, thereby published as a book under the title of (Kurdan Pars u Kirman).

I have translated the above mentioned book into Kurdish using Kurdish script with a preface, a lexicon of words and footnotes.

# دیوە تیۆرییەكانی ڕێزمانی بەركاری ڕاستەوخۆ

د. شێركۆ بابان

## ١- دەسپێك:

لە ڕێزمانی كوردیدا، كۆلكەی بەركار شرۆفەكارییەكەی زانستی زۆر هورد و سفتی هەیە، نەك ڕێزمانێكی ترنگ و تەنك و توێژاڵی. ئەو دیاردەیەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی كە (ڕێزمانی بەركار) بەراورد كراوە بەڕێزمانی ئەو زمانانەی كە ڕێزماننووسان، باشتر لە زمانی كوردی، شارەزاییان تێدا هەیە. ئەوەش لەیاد كراوە، كە بزاڤی پەرەسەندن لەئارادایە و بەهرەی (كوردیزانی) وزەمان پیّ دەبەخشێت بۆ ئەوەی نەهێڵین تەونی واتایی لە بزاڤی ئاخاوتندا بەرەو ئالۆزی بڕوات. لە ئەم سەروبەندەدا، پەنا براوە بۆ چەندین میكانیزمی ڕێزمانی، لە بۆ ئەوەی جێناوە لكاوەكانی بەركار بخەینەبەر (ڕوخسارگۆڕكیّ)، چونكە هەر دوو پۆڵە جێناو هەیە و دەبێت بەچەشنێك دابەش بكرێن كە بەشی هەموو ئەو كۆلكانە بكەن، كە دەبن بە تەواوكەری ڕستەیەكی سادە. لە ڕاستییدا، سەرەڕای (بەركاری ڕاستەوخۆ)، بەركاری ناڕاستەوخۆ هەیەو جێناوی خاوەنیەتی هەیە، لەئاستی هەر ناوێك كە لە پلیكانەی ڕستەدا، بەڕێزمان جێی ببێتەوە. هەر لەبەر ئەو هۆیە، لە

ئەم نووسینەدا، گەمەیەکی بیرکارییانەی هورد دەست پێ دەکەین و گشت بارە لێڵەکان دەدەین لە (خشتبڕ)ێکی ڕێزمانی و بیرەکی.

## ٢- **ڕێزمانی** (**بەرکار**):

کۆلکەی (بەرکار) لە ڕژێمی رستەدا دوو دیوی هەیە و ئەو دوو دیوە ناتوانن بەیەکەوە ئامادەبن لەهەمان رستەدا و ئەگەر ئامادە بوون، ئەوا یەکێکیان لە دەرەوەی ڕێزمانی ئەو رستەیەیە. بۆ نموونە، دەگوترێت:

**من [تۆ] دەبینم**

یان

**من دە (ت) بینم**

هەر بۆ زانین، لە ئەم نموونەیەدا و لەنموونەکانی داهاتوودا، کۆلکەی (بەرکاری جودا) بە کەوانەیی چوارگۆشەیی جودا دەکەینەوە. لە رستەی یەکەمدا، جێناوی جودای (تۆ) بریتییە لە (دیوی جودا) لە (بەرکار) و لەرستەی دووەمدا، جێناوی لکاوی (ت) بریتییە لە (دیوی لکاو) لە هەمان (بەرکار). ئەم دوو دیوە، هەر یەکێکیان بۆی هەیە کە ئەرکی (بەرکار) بگێڕێت لەیەك رستەدا. کەواتە، ڕێزمانی (بەرکار) جودایە لە ڕێزمانی (بکەر). بۆ نموونە، لە ئاستی بکەردا، جێناوی (من) و جێناوی لکاوی (م) بۆیان هەیە لەهەمان رستەدا ئامادەبن، وەك لە ئەو دوو رستەیەی سەرەوەدا دەرکەوتوون.

## ٣- **جێبازی** (**بەرکار**):

له رسته‌ی زمانی کوردیدا، کۆلکه‌ی (به‌رکاری جودا) به‌رده‌بازێك، یان جێبازێك، یان کورسییه‌ك، هه‌ڵده‌گرێت تا جێناوی لکاوی (بکه‌ر) باز بداته سه‌ری، وه‌ك:

**من [تۆ](م) بینی**

له ئه‌و رسته‌یه‌دا، جێناوی (م) بازی داوه بۆ سه‌ر به‌رکاری جودا (تۆ)، کاتێك که ده‌رفه‌تی بۆ ره‌خسێنراوه که باز بدات. به واتایه‌کی تر، جێناوی (م) بازی داوه‌ته سه‌ر ئه‌و کورسییه‌ی که (به‌رکار) هه‌ڵی ده‌گرێت و ئه‌و کورسییه‌ش بریتییه له کۆلکه‌یه‌کی سه‌خت (hard)، چونکه لاناچێت له بیردا و هه‌ر ده‌مێنێت و له (به‌رکار) نابێته‌وه. هه‌ر بۆ نموونه، کاتێك که له‌رسته‌ی (تێپه‌ڕ)دا، دیوه جوداکه‌ی (به‌رکار) ئاماده‌ده‌بێت، ده‌بێت جێناوی لکاوی بکه‌ر (م، ت، ی، مان، تان، یان) بازی دابێته سه‌ر ئه‌و کورسییه و له‌سه‌ری دانیشتبێت، وه‌ك:

**من [ئه‌و](م) بینی**
**من [ئه‌وان](م) بینی**
**من [شیلان](م) بینی**
**من [شیلان و شلێر](م) بینی**
**من [ئه‌و پیاوه](م) بینی**
**من [ئه‌و پیاوه](م) بینی که خزمی ئێوه‌یه**

له راستیدا، ئه‌گه‌ر دیوه لکاوه‌که‌ی به‌رکار (جێناوی لکاو) به‌کار

نەهێنرابێت، ئەوا دیوە جوداکەی بەرکار (جێناوی جودا و کومەلەی ناو)، ئەو کورسییە پتەوە هەڵ دەگرێت و پێشوازی دەکات لە ریزە جێناوی لکاوی (بکەر) تا باز بدات بەسەر پلیکانەی رستەدا، لە کۆتاییەوە بەرەو نووکەکەی، تا لەسەر دوا پلەی پلیکانەکە ڕابوەستێت، کە بریتییە لە (بەرکاری جودا)، وەك:

ـ کاتێك دەرفەت نارەخسێت بۆ بازدان:

**من [..........] بینی (م)**

ـ کاتێك بەرکاری (شیلان) هەبێت و دەرفەت دەرەخسێت بۆ بازدان:

**من [شیلان] (م) بینی (....)**

## ٤- سەختایەتی لە جێبازی بەرکاردا:

لە بڕگەی پێشوودا، کورسی بەرکار، یان جێبازی بەرکار باسکرا، لە ئەوێدا بینرا کە کورسی بەرکار پتەوەو هەر کاتێك کە بەرکاری جودا (جێناوی جودا و کومەڵەی ناو) لە ریزەکەدا بێت، پێویستە کە یەکێك لە جێناوە لکاوەکانی بکەر (م، ت، ی، مان، تان، یان) بازی دابێتە سەری و لەسەر ئەو کورسییە پتەوە دانیشتبێت. بۆ نموونە، لە رستەی رابردوودا جێناوی (م) بازی داوەتەسەر جێبازی بەرکار (شیلان) و لەسەر ئەو کورسییە جێگیر بووە کە هەڵی گرتووە. ئەوەش لەیاد نەکەین، سەرپاکی ئەو نموونانەی کە لەپێشەوە سەوداکران، لە (دەمکاتی رابردوو)دا بوون و دەشێت پتەوێتی

کورسییەی (بەرکار) بکەوێتە بەر (مەحەك) ئەگەر دەمکاتەکە (رابردوو) نەبێت. لە بۆ پاساوی ئەو راستییەی کە ئەو کورسییە سەخت و پتەوە و هەر دەمێنێت و پێشوازی دەکات لە جێناوی (بازدەر)، دەتوانین روو بکەین لە دەمکاتەکانی تر، وەك:

**<u>یەکەم: دەمکاتی رانەبردوو:</u>**

بۆ نموونە، دەگوترێت:

**من [شیلان](...) دەنێر (م)**

**ئێمە [شیلان](...) دەنێر (ین)**

لە ئەم رستانەدا، جێناوەکانی (م، ین)، بریتین لە جێناوی لکاوی بکەر، بەلاّم لە جۆری (بازنەدەر)، وەك (م، یت، ێت، ین، ن، ن). واتە، بەرکاری جودا (شیلان) کورسییەکەی داناوە (...)، بەلاّم جێناوی لکاوی (بازدەر) لە ریزەکەدا نییە تا باز بداتە سەری. هەر لەبەر ئەو هۆیە کورسییەکە بە (بۆش) ماوەتەوە. بۆ سەلماندنی ئەم راستییە، دەتوانین رستەکە متوربە بکەین بە جێناوی بازدەر، وەك:

**من [شیلان](...) بۆ (تۆ) دەنێر (م)**

**ئێمە شیلان بۆ (تۆ) دەنێر (ین)**

لەئەم رستانەدا، دەتوانین جێناوی جودای (تۆ)، کە بریتییە لە بارگەی

ئامرازی (بۆ) بگۆڕین بە جێناوی لکاوی بازدەر لە چەشنی (م، ت، ی، مان، تان، یان)، وەك:

**من [شیلان]$^{(...)}$ بۆ (ت) دەنێر (م)***

**ئێمە [شیلان]$^{(...)}$ بۆ (ت) دەنێر (ین)***

ئەم دوو رستەیە هێمایان لەسەر دانراوە و لەنگن (*)، چونکە بەرکاری (شیلان) کورسی پتەوی هەیە، بەڵام جێناوی بازدەری (ت) قەدەغە کراوە لە (بازدان). هەر بۆ نموونە، ئەگەر گوترا:

**من [شیلان] $^{(ت)}$ بۆ (....) دەنێر (م)**

**ئێمە [شیلان]$^{(ت)}$ بۆ (....) دەنێر (ین)**

ئەوا، رێزمانەکە راست دەبێتەوە، چونکە ئەو کورسییە بیرەکییە فەرامۆش ناکرێت کە بەرکاری جودا (شیلان) هەڵی گرتووە بۆ جێناوی بازدەر لە چەشنی (م، ت، ی، مان، تان، یان).

**دووەم: لە فەرمانی راستەوخۆدا:**

وەك لەپێشتردا بلاۆمان کردووەتەوە، ئێمە رێزمانی (فەرمانی راستەوخۆ) لە پەرێزی رێزمانی (دەمکاتی رانەبردوو)دا دەبینین. هەر لەبەر ئەوە، لە ئێرەش دا، سەختێتی و پتەوێتی ئەو کورسییە دەردەکەوێت کە (بەرکاری

جودا) هەڵی گرتووە، وەك:

تۆ [شیلان](...) بنێرە

یان:

تۆ [شیلان](...) بۆ (من) بنێرە

یان:

تۆ [شیلان] (م) بۆ (....) بنێرە

کەواتە، ئەو کورسییەی کە (بەرکاری جودا) هەڵی گرتووە (...) بۆ جێناوی لکاوی (بازدەر) سەختەو پتەوە و نەگۆڕە و لە نێو تەونی بیری منداڵی کورددا، بە جوانی و بە وردەچنی هەڵ کۆڵراوە و هەر کاتێك کە جێناوی لکاوی بازدەرم لە ریزەکەدا بێت، چی لە ئەرکی بکەردا و چی لە بارگەی ئامرازی پەیوەندیدا، دەبێت پێشوازی لێ بکات. بێ گومان، ئەو جۆرە جێناوە شەش روخساری هەیە کە بریتین لە (م، ت، ی، مان، تان، یان).

## ٥- لە رکێفی رێزمانی بەرکاردا:

بەپێی ئەوەی لەپێشەوە باس کرا، کوڵکەی (بەرکار) قەوارەیەکی پتەوی هەیە و لەسەر ئەو قەوارە رێزمانییە کورسییەك هەیە بۆ جێناوی لکاوی بازدەر لە چەشنی (م، ت، ی، مان، تان، یان)، بۆ ئەوەی وەك (بەردەبان)ێك جێناوەکە بازبداتە سەری و لەسەری دابنیشێت. لەگەڵ ئەوەش دا، ئەو راستییە سەلمێنرا کە ئەو کورسییە پتەوە و دەمێنێت و ئەگەر جێناوی

لکاوی (بکەر)یش لە جۆری بازدەر نەبێت، ئەوا جێناوی لکاوی سەر ئامرازەکانی پەیوەندی دەتوانن باز بدەنە سەری و لەسەری داساکێن. سەرەرای ئەوەی گوترا، هەندێك کۆلکەی تر هەیە کە دەکەونە ژێر رکێفی رێزمانی بەرکارەوە و لە قەوارەکەی دا دادەنیشن و کورسیەکەی بەرکاریش پێشوازی لە جێناوی لکاوی بازدەر دەکات، وەك:

**یەکەم:** لە رێزمانی کاری (بوونی بوونایەتی)دا، میکانیزمی وەرچەرخانی ئەرکی جێناو دەکەوێتە کار، وەك:

**شیلان [منداڵ] (ی) بوو (....)**

کەواتە، وشەی (منداڵ) چووەتە نێو قەوارە بیرکارییەکەی (بەرکار) و کورسییەکەشی والا کردووە، لە بۆ بازدانی جێناو (بکەر)، لە چەشنی (م، ت، ی، مان، تان، یان). بە واتایەکی تر، کۆلکەی (بەرکار) قەوارەکەو کورسییەکەی داوە بە کرێ بە کاری (بوونی بوونایەتی) و دیوێکی تێپەڕی بۆ چێ کردووە، لە بۆ واتای (منداڵ بوون).

**دووەم:** لە رێزمانی (هەبوون)دا، میکانیزمی وەرچەرخان هەیە، وەك:

**شیلان [پارە] (ی) هەبوو (....)**

لە ئێرەش دا، کۆلکەی (بەرکار) قەوارە بیرکارییەکەی و کورسییەکەی داوە بەکرێ بەکاری (هەبوونی تێنەپەڕ) بۆ ئەوەی دیوێکی تێ پەڕ پەیدا بکات، لە بۆ واتای (خاوەنداری).

**سێیەم:** کاری (بوونی ئێستایی) هەمان میکانیزم پیادە دەکات، وەك:

**من و شیلان سەرما(مان) بوو**

لە ئێرەشدا، کۆلکەی (بەرکار) قەوارەکەی بەخشیوە بە وشەی (سەرما) بۆ ئەوەی ببێت بە (بەرکار) و پێشوازیش بکات لە جێناوی لکاوی (بەرکار) لەچەشنی (م، ت، ی، مان، تان، یان). ئەم جۆرە رستەیە واتای هەست کردنی لەش و دەروون هەڵ دەگرێت.

**چوارەم:** کاری (کەوتن) هەمان میکانیزم پیادە دەکات، وەك:

**من و شیلان [بەش](مان) ناکەوێت**

بەهەمان میکانیزم قەوارەی کۆلکەی (بەرکار) دراوە بە کاری تێنەپەڕی (کەوتن) بۆ ئەوەی بەرکاری (بەش) وەربگرێت و دیوێکی (تێ پەڕ) پەیدا بکات.

**پێنجەم:** کاری (ویستن) تێپەڕەو کەچی لە ڕانەبردوودا وەردەچەرخێت، بەڵام بە شێوازێکی زۆر سرك و دژوار و نەگیر، وەك:

**شیلان [پارە] (ی) دەو (ێت)**

لە ئێرەدا، دەڵێیت کە کاری (ویستن) تێنەپەڕە لە چەشنی (کەوتن)،

باسکراو لەخاڵی پێشوودا، بە میکانیزمی (وەرچەرخان) بووە بە (تێپەڕ)، ئەگەرنا، دەبا بگوترابا:

**شیلان [پارە][...] دەوێت**

لەسەر تەرازووی کاری تێپەڕ (بردن)، وەك:

**شیلان [پارە][...] دەبات**

بەڕاستی سەیرە، لەئاستی ئەم دیاردە دەگمەن و نەشازەدا، گشت بەڵگەکان پاساوی ئەوە دەخەنە روو کە لە ئاستی کاری (ویستن)دا، راستیەکی سەیر و سەمەرە هەبێت، وەك:

[کاری ویستن دوو دیوی هەبێت، لە دیوی رانەبردوودا (تێنەپەڕ) بێت و لە دیوی رابردوو (تێپەڕ) بێت]

لەبەر رووناکی ئەو راستییەی کە خراوەتە نێو چوارچێوە، لە (رابردوو)دا کاری (ویستن) رێزمانێکی زۆر ئاسایی هەیە، وەك گشت کارە تێپەڕەکان. بەڵام، لە (رانەبردوو)دا، بارەکە زۆر ئاڵۆزە و دەڵێیت کاری (ویستن) تێ نەپەڕە، وەك (دەوێت) و ئەمجار ئەو رستە تێنەپەڕە وەرچەرخابێت بۆ وەرگرتنی (بەرکار)، وەك:

**من [پارە][م] دەوێت**

| | | |
|---|---|---|
| تۆ | [پارە](ت) | دەوێت |
| ئەو | [پارە](ی) | دەوێت |
| ئێمە | [پارە](مان) | دەوێت |
| ئێوە | [پارە](تان) | دەوێت |
| ئەوان | [پارە](یان) | دەوێت |

لە ئەم کارەدا، رستەی تێنەپەڕی (دەوێت) قەوارەی بەرکاری بەکرێ گرتووە بۆ وشەی (پارە) و ئەمجار جێناوی لکاوی (بکەر) بازی داوەتەسەری.

**شەشەم:** لە دەستەواژەیەکدا، وەک:

**من [کەس] (م) لەگەڵ (....) نیە**

وشەی کەس چووتە نێو قەوارەی کۆلکەی (بەرکار) و کورسییەکەی خستووەتە پێشوازی بۆ جێناوی بازدەر (جێگۆڕ) لەچەشنی (م، ت، ی، مان، تان، یان).

لەئەم رستەیەدا، ئەگەر نەهێڵین جێناوی (م) بازبدات، وەک:

**من [کەس] لەگەڵ (م) نیە**

مچورکی رستەیەکی (تێنەپەڕ) دەبزوێت و وشەی (کەس) دەبێت بە (بکەر)، بەڵام ئەگەر بمانەوێت وشەی (کەس) بکەین بە (بەرکار)، دەبێت رێ لە جێناوی بازدەر (م) نەگرین، چونکە جێگۆڕە و کۆلکەی بەرکاریش

کورسییەکی هەیە بۆ پێشوازی لە ئەو (باز)ەی کە ئاراستەکەی ڕاست و دروستە.

**حەوتەم:** لە ڕستەیەکدا، وەك:

**من [نان] (م) پێ (....) ناخورێت**

کاری (بکەر نادیار) لە ئارادایەو بەڵام وشەی (نان) کە جێگری بکەرە، قەوارەی (بەرکار)ی بەکرێ گرتووە و جێناوی لکاوی (بەرکار) بازی داوەتە سەر کورسیەکەی (بەرکار). لەئاستی ئەم نموونەیەدا، مەرج نیە هەر ئامرازی (پێ) هەبێت، دەشێت ئامرازێکی تر بخەینە گەڕ، وەك ئامرازی (بۆ):

**من [نان] (م) بۆ (....) ناخورێت**

کەواتە، وشەی (نان) کە جێگری بکەرەو لە ڕێزمانی (بکەر)دا جێی دەبێتەوە، جارێکی تر گەڕاوەتەوە و بووەتەوە بە (بەرکار)، بەڵام بە میکانیزمێکی تر. هەر بۆ نموونە، لە ڕستەیەکدا، وەك:

**شیلان [نان] دەخوات**

وشەی (نان) بریتییە لە (بەرکار)ێکی ئاسایی و لە پەرێزی کارێکی تێپەڕی ئاساییدایە لەچەشنی (خواردن). پاشان، لەڕستەیەکدا، وەك:

**(نان) دەخورێت**

وشەی (نان) بووە بە (جێگری بکەر) لە ئاستی چاوگی (بکەرنادیار)، کە

بریتییە لە (خوران). لە پاشتردا، وشەی (نان) بووەتەوە بە (بەرکار)، بەڵام بە شێوازێکی نا ئاسایی، وەك:

**من [نان] (م) پێ (....) دەخورێت**

## ٦- قەوارەی بەرکار:

بەپێی ئەوەی لەپێشەوە باسکرا، لە نێو (بیردان)ی هەموومان‌دا، قەوارەیەکی بیردۆزەیی هەیە بۆ (بەرکار) و ئەو قەوارەیە لە پلیکانەی بیردۆزەیی رستەدا پتەوە و سەختە. لە هەمان کاتدا، لەسەر ئەو قەوارەیە و لەلای کلکەوە، کوسییەکی پتەو و سەخت هەیە بۆ جێناوی (بازدەر) لە چەشنی (م، ت، ی، مان، تان، یان)، وەك:




کەواتە، لە قەوارەی بەرکاردا، رێزمانی (کۆمەڵەی ناو) باڵادەستەو دەشێت (جێناوی جودا و رێزمانی کۆمەڵەی ناو) بکەوێتە کار. لە هەمان کات دا، لەسەر ئەو کورسییەی کە پێشوازی لە جێناوی لکاوی (بازدەر) دەکات، دەشێت یەکێك لە ئەو جێناوانە لە کاردا بێت. سەرەڕای ئەوەی کە باس کرا،

قەوارەی بەرکار و کورسییەکەی ڕێزمانی (بەرکاری جودا)پێك دەهێنن.

بەپێی ئەوەی کە خرایە ڕوو، لە پلیکانەی ڕستەدا، هەر کاتێك کە (کۆمەڵەی ناو) دەرکەوت و ئەو کۆمەڵەیە یەکێك لە ئەو شەش جێناو بازدەرەی هەڵ گرتبوو، ئەوا ئەو (ناو)ە یان ئەو (کۆمەڵەی ناو)ە لە قەوارەی بەرکاری جودادایە و لەژێر ڕکێفی (ڕێزمانی بەرکار) دایە. بۆ نموونە، لە ئەم ڕستانەدا، وشەی (پارە) لە ژێر ڕکێفی ڕێزمانی بەرکاری جودادایە:

- من [پارە](م) نارد
- من [پارە](ت) بۆ دەنێرم
- تۆ [پارە](ی) بۆ بنێرە
- تۆ [پارە](ت) هەیە
- تۆ [پارە](ت) ناکەوێت
- تۆ [پارە](ت) دەوێت
- تۆ [پارە](ت) لەگەڵ نیە
- تۆ [پارە](ت) پێ یە
- تۆ [پارە](ت) پێ نامێنێت

لە ئەم هەڵوێستەدا، دەبا ڕووبەری زمانی کوردی ڕابماڵین و (جۆرەکانی ڕستەی تێپەڕ) دیاری بکەین، چونکە لە هەر جێیەکدا کە کۆمەڵەی ناو، جێناوی بازدەری وەرگرتبێت و ئەو جێناوە بۆ (خاوەنێتی) نەبێت، ئەوا جۆرێك لە ڕێزمانی بەرکار (کاری تێپەڕ) لە ئارادایە.

## ٧- بەرکاری جودا بەبێ جێناوی لکاوی بازدەر:

لە رووبەری زمانەکەدا، تەنهاو تەنها لەیەك هەل و مەرجدا، (بەرکاری جودا) لە ریزی رستەدا دەردەکەوێت و ئەو کورسییەش کە هەڵی گرتووە بۆ جێناوی (بازدەر) بە بۆشی دەمێنێتەوە، وەك:

**شیلان [نان](....)     دەخوات**

کەواتە، بەدیاری کراوی لە کاری تێپەڕی ئاسایی و لە دەمکاتی رانەبردوودا، کورسییەکەی جێناوی بازدەر بە چۆڵی دەمێنێتەوە، چونکە ئەو جۆرە جێناوە (م، ت، ی، مان، تان، یان) لە ریزی رستەکەدا نییە. لە بەرانبەردا، ئەگەر لەریزەکە هەبێت، ئەوا رێزمانەکە زۆری لێ دەکات کە باز بداتە سەر ئەو کورسییە، وەك:

**شیلان [نان] (م) بۆ (....) دەهێنێت**
**شیلان [نان] (ت) بۆ (....) دەهێنێت**
**شیلان [نان] (ی) بۆ (....) دەهێنێت**
**شیلان [نان] (مان) بۆ (....) دەهێنێت**
**شیلان [نان] (تان) بۆ (....) دەهێنێت**
**شیلان [نان] (یان) بۆ (....) دەهێنێت**

لە ئەم هەڵوێستەدا، ئەگەر نەهێڵین ئەو جێناوانە بازبدەن، ئەوا (نارێزمان) پەیدا دەبێت. سەبارەت بە فەرمانی راستەوخۆ، هەمان میکانیزم دەچەسپێت، چونکە هاورێزمانە لەگەڵ رێژەکانی دەمکاتی رانەبردوودا. واتە، لە ڕێژەی فەرمانی راستەوخۆشدا، دەشێت کورسییەکەی جێناوی بازدەر بە

بۆشی بمێنێتەوە، وەك:




لە ئەم نموونەیەش دا، ئەگەر ئەو بازەی جێناوی بازدەر قفل بکەین، ئەوا نارێزمانی پەیدا دەبێت، چونکە جێناوی جێگۆڕ (جێناوی بازدەر) لە ریزەکەدایە و کورسییەکەی (بەرکاری جودا) لە نێو بیردا بەبۆشی هەیە. هەر لەبەر ئەوە، جێناوی (مان)، یان هەر جێناوێکی تر لە ئەو سێتە، بازدەدات و ئەو کورسییەش وەك (بەردەبان)ێك پێشوازی لیٚ دەکات.

## ٨- جێناوی خاوەنیەتی لەقەوارەی بەرکاردا:

زۆر جار جێناوی خاوەنەتی لە چەشنی (م، ت، ی، مان، تان، یان) دەلکێت بە بەرکاری جوداوە. ئەم جۆرە جێناوە هەر چەند (بازدەر) بن بەلاٚم کەوتوونەتە نێو قەوارەی بەرکار و لەپاش کورسییە ریز دەبن نەك لەپێشی، وەك:

من [براکە (ت)]$^{(م)}$ ناردووە

لەئەم هەلۆیستەدا، جێناوی (ت) لەناو قەوارەکەدایە و کەوتووەتە پاش کورسییەکە و جێناوی (م)، کە جێناوی (بکەر)ە، لەسەر کورسیەکە دانیشتووە. هەر بۆ سەیر دەشێت هەر دوو جێناوەکە هەمان جێناوبن، وەك:

من [براکە (م)](م)        ناردووە

تۆ [براکە (ت)](ت)        ناردووە

کەواتە، جێناوی بکەر بە جێگۆڕکێ (بە بازدان) گەیشتووە بە قەوارەی (بەرکار) و جێناوی خاوەنەتی بە بێ بازدان لکاوە بە بەرکارەوە. لە رووی ریزبەندەوە، جێناوی خاوەنێتی دەکەوێتە پێش جێناوی بکەر، بەئەم چەشنە:




کەواتە، هیچ جێناوێکی جێگۆڕ ناتوانێت لە کورسی بەرکار دابماڵێت و بازێکی تر بدات.

ئەوەش لەیاد نەکەین کە لەباری ئاوهادا، یەکێك لە ئەو دوو جێناوە یەکسانە (بە کەس و ژمارە)، سووك دەکرێت و هەر یەکێکیان گۆ دەکرێت، وەك:

من [براکە (...)](م)        ناردووە

بێ گومان، ئەو جێناوەی کە گۆ ناکرێت، بریتییە لە جێناوی خاوەنێتی،

چونکە ئەرکە ڕێزمانیەکەی لاوەکیە. لەبەرانبەردا، ئەگەر هەردوو جێناوەکە یەکسان نەبوون، ئەوا بەناچاری دەبێت هەردووویان گۆ بکەین، وەك:

**من [براکە (ت)](م) ناردووە**

لە شێوەزاری سلێمانیدا، ئەم جۆرە ڕستەیە بە جۆرێکی تر سووك دەکرێت، وەك:

**من [براکە (...)](م) ناردوو (یت)**

واتە، جێناوی خاوەنێتی (ت) دەگۆڕدرێت بە جێناوی (یت) لە کۆمەڵەی (م، ێت، ــ، ین، ن، ن). ئەم جێناوەش دەگەڕێتەوە بۆ پاش کارەکە چونکە جێگۆڕ نیە و لە جێی دیاری کراوی خۆیدا دادەساکێت. لەئەم میکانیزمەدا، هەر شەش جێناوە جێگۆڕەکە بەئەم چەشنە دەگۆڕین:

| جێناوی جێگۆڕ (بازدەر) | | جێناوی جێ نەگۆڕ |
|---|---|---|
| م | ← | م |
| ت | ← | یت |
| ی | ← | ـــ |
| مان | ← | ین |
| تان | ← | ن |
| یان | ← | ن |

ئێستاش دەتوانین ئەو شەش جێناوە نموونە ڕێژ بکەین، وەك:

**تۆ [براکە (م)](ت) نارد ← تۆ [براکە (...)](ت) نارد (م)**

**من [براکە (ت)](م) نارد ← من [براکە (...)](م) نارد (یت)**

**من [براکە (ی)](م) نارد ← من [براکە (...)](م) نارد (....)**

**ئێوە [براکە (مان)](تان) نارد ← ئێوە[براکە (...)](تان)نارد (ین)**

**ئێمە [براکە (تان)](مان) نارد ← ئێمە[براکە (...)](مان) نارد (ن)**

**ئێمە [براکە (یان)](مان) نارد ← ئێمە[براکە (...)](مان) نارد (ن)**

بێ گومان ئێمە لەگەڵ ئەو زێدەڕۆییەدا نین و ناهێڵین جێناوی خاوەنێتی لە جێی خۆی بترازێت و بگۆڕدرێت بە جێناوێکی تر کە هی (خاوەنێتی) نییە.

## ٩- پاشەکشێی جێناوی لکاو:

وەك لە نموونەیەکی کۆپلەی پێشوودا باسکرا، جێناوی خاوەنێتی (ت) لە کۆمەڵەی (م، ت، ی، مان، تان، یان). ڕوخساری گۆڕیوە بۆ (یت)، لە کۆمەڵەی (م، یت، ـــ، ین، ن، ن) لە ئەم میکانیزمەدا، ئەرکی جێناوی (یت) گۆڕاوە و ئەرکێکی تری پێ سپێردراوە، کە بریتیە لە (خاوەنێتی) و پاشەکشێی کردووە بۆ لای کلکی کارەکە. لە زمانی کوردیدا، چەند بارێکی شیاو هەیە بۆ ئەوەی ئەم میکانیزمە ڕوو بدات، چونکە چەند جێگایەك هەیە کە پێشوازی بکات لە جێناوەکانی (م، ت، ی، مان، تان، یان)، وەك:

**یەکەم:** لە شێوەزاری ناوچەی کەرکوك و گەرمیان دا، ئەو ڕیزە جێناوە

دەبن بە (بکەر) و دەبن بە (بەرکار)یش لە ڕێژەی رابردووی کاری تێ پەڕدا، وەك:

**ئێمە هەڵ (یان) (مان) گرت**

لە ئەم نموونەیەدا، جێناوی (یان) و جێناوی (مان) هەردوویان لە کۆمەڵەی جێناوی جێگۆڕن، بەڵام ئەرکەکانیان جیاوازە، جێناوەکەی پێشەوە (یان) لە ئەرکی (بەرکار) دایە و جێناوی پاشی (مان) لە ئەرکی (بکەر) دایە. تەنانەت هەر لە هەندێك نموونەدا، دەشێت هەردوو جێناوەکە بریتیبن لە جێناوی (یان)، وەك:

**ئەوا هەڵ (یان) (یان) گرت**

لە زاری سلێمانیدا، ئەم جۆرە ئاخاوتنە بە بەهرەی (کوردیزانی) پەرەی سەندووە و جێناوی (بەرکار) بووە بە کۆمەڵەکەی تر، کە جێ نەگۆڕە و پاشەکشێ دەکات، وەك:

**ئەوان هەڵ (م) (یان) گرت : ئەوان هەڵ (...) (یان) گرت (م)**
**ئەوان هەڵ (ت) (یان) گرت : ئەوان هەڵ (...) (یان) گرت (یت)**
**ئەوان هەڵ (ی) (یان) گرت : ئەوان هەڵ (...) (یان) گرت (...)**
**ئەوان هەڵ (مان) (یان) گرت : ئەوان هەڵ (...) (یان) گرت (ین)**
**ئەوان هەڵ (تان) (یان) گرت : ئەوان هەڵ (...) (یان) گرت (ن)**
**ئەوان هەڵ (یان) (یان) گرت : ئەوان هەڵ (...) (یان) گرت (ن)**

لە ئەم نموونانەدا، زمانەکە ئەرکێکی تازەی بەخشیوە بە ریزە

ئەوەی لێرەدا جێی ئاماژە بۆ کردنە، گەلێ جار دوو وشەکان یەکیان بە یەکپارچەیی و ئەوی تریان بە دوو پارچەیی دێن، بەڵام لەمەشدا چ زیانێك نییە ئەگەر هەردوو وشەکان بە یەکپارچەیی هاتبن، یان یەکیان یەك پارچەو ئەوی تریان بە دوو پارچەیی هاتبێت، چونکە گرنگ ئەوەیە لە چوار مەرجە سەرەکییەکانی ڕواڵەتیاندا بە یەکتری یەکسانبن، بۆیە هەندێکی ڕەوانبێژان ئەوە بە گرنگ نابینن، هەندێکی تریش بۆ هەریەکەیان ناوێك بەکاردێنن، واتە: ئەگەر دوو وشەکان هەردووکیان یەك پارچە بوون، ناوێکی لێدەنێن و ئەگەر دوو وشەکان یەکیان یەکپارچەو ئەوی تر دوو پارچەبوو ناوێکی تری لێدەنێن.
بەلای منیشەوە ئەوە زۆر گرنگ نییە، چونکە ئاڵۆزی دروست دەکات، ڕەوانبێژیش زانستە دەبێت بە سادەیی و ڕوونی پێشکەش بکرێت، نەك ئاڵۆزی زۆری بۆ دروست بکەین.. بۆ نموونە:

**- چەند ساڵە ئاشنای شەوی بێداری یەکترین**

**وەك سەرسەرین، شەوێ سەر ناکەینە سەر سەرین...** لا ١٠٦.

(سەرسەرین) لە نیوەی دێڕی دووەمدا کە بەسەریەکەوە هاتووە، واتە: کەسێکی سەرسەری و بێ مبالات، لە دواتریشدا هەر لەو نیوەدێڕەدا وشەی (سەر سەرین) هاتووە، کە دوو بەشە، بەشی یەکەمی (سەر) بە واتای ڕووی سەرەوەی شت و بەشی دووەمیشی (سەرین) بە واتای (بالیف) هاتووە، بەڵام لە ڕواڵەتدا چ جیاوازییەکیان نییە، بۆیە (ڕەگەزدۆزی تەواو)یان دروست کردووە.

**- سەرداری ئێمە بوو کە لەسەر دار بە پێکەنین**

**بانگی ئەکرد: بە کوشتنی من میللەتم ئەژین...** لا ١٠٤.

لەم نموونەیە دوو وشەی (سەردار) و (سەر دار) هاتوون، یەکەمیان بەسەریەکەوەیە، واتە: (سەرکردەو پێشەوا)، دووەمیشیان بە دوو پارچەیی هاتووە، پارچەی یەکەمی (سەر) بە واتای ڕووی سەرەوەی شت و بەشی دووەمیشی (دار) هەر بە واتای (دار) هاتووە، کە بەسەر یەکەوە بە واتای (سێدارە) دێن، بەڵام لە ڕواڵەتدا چ جیاوازییەکیان نییە، بۆیە (ڕەگەزدۆزی تەواو)یان دروست کردووە.

**- منیش دوای ئەوان ئەڕۆم بە نۆبە**

**لە گوناه تۆبە، بەخشندەش تۆبە...** لا ٢٤٥.

لە نیوە دێڕی دووەمدا وشەی (تۆبە)ی یەکەم بە واتای پەشیمانبوونەوەو داواکردنی لێخۆشبوون دێت، وشەی (تۆبە)ی دووەمیش بە واتای ئەی خودایە بەخشندە (تۆ) (ببە).. بەمەش ڕەگەزدۆزی تەواو دروست بووە.

**دووەم: <u>ڕەگەزدۆزی نا تەواو (الجناس الناقص)</u>** : ئەو ڕەگەزدۆزییەیە، کە دوو وشەکانی لە ڕواڵەتدا تەواو وەکو یەك نین، واتە دوو وشەکانی لە ڕووی ژمارەی پیتەکانیان، یان شێوەی پیتەکانیان، یان جۆری پیتەکانیان، یان ڕیزبوونی پیتەکانیان تەواو وەکو یەك نین و جیاوازییەکیان لە نێواندا هەیە، جا دەشێت جیاوازییەکە کەم بێت و دەششێت جیاوازییەکە زۆر بێت، لە ڕووی واتاشەوە دەبێت هەریەکەو واتای سەربەخۆی خۆی هەبێت.. بۆ نموونە:

**- شەو شەونمی ئەوانە چەمەن ئاو ئەخواتەوە**

**ڕۆژ هەڵمی ئاوی چاوی منە سەریەخاتەوە...** ل ١٠٦.

لە نیوە دێڕی یەکەمدا وشەکانی (شەو) و (شەونم) تا ڕادەیەك لێکچوون لە نێوانیاندا هەیە، بەڵام لێکچوونەکە تەواو نییە، بەڵکو وشەی (شەونم) بە دوو پیتی چوارەم و پێنجەم لە وشەی (شەو) زیادە، ئەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواو) دروست دەکات.

**- ڕۆژی تازەی ساڵی تازەی ئێمە هات**

**ڕۆژهەڵات ڕۆژی هەڵات سەرما هەڵات...** ل ١٣٩.

لە نیوە دێڕی دووەم (ڕۆژی هەڵات) بە یەك پیت لە ناوەڕاستی هەردوو وشە سادەکانیدا لە وشەی (ڕۆژهەڵات) زیادە.

## جۆرەکانی (ڕەگەزدۆزی ناتەواو)

دەبێ بگوترێت، کە (ڕەگەزدۆزی ناتەواو) زیاتر لە جۆرێکی هەیە، گرنگترینیان لای پیرەمێرد بریتینە لەمانەی خوارەوە:

**١- ڕەگەزدۆزی ناتەواوی موزاریع:** ((بریتییە لە بوونی دوو وشەی هاوشێوە، کە بە تەنیا لە یەك پیت لێك جیابن))[١٤]، بۆ نموونە:

**- گەزۆ بنێشت کەتیرە، سمۆرە ڕێوی دەڵەك**

**بەرازو گورگ و چەقەڵ، ئاسك و پڵنگی بەڵەك...** ل ٩٠.

وشەکانی (دەڵەك) و (بەڵەك) لە پیتی یەکەمیان جیاوازن، بەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی موزاریع) دروست دەکەن.

ـ فەمووبووت ئێوە نامرن ئەمێنن

تا سەر ئازادی گەڵتان ئەسێنن...                    لا ١١٢.

وشەکانی (ئەمێنن) و (ئەسێنن) هەردووکیان لە شەش پیت پێکهاتوون، بەڵام لە پیتی سێیەمیان لێك جیاوازن، بەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی موزاریع) دروست دەکەن.

**٢ـ ڕەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی**: ((بریتییە لە بوونی دوو وشە، ئەگەرچی زۆربەی پیتەکانیان لەیەك جیابێ، بەڵام لەسەر یەك کێش بن))[١٥]، بۆ نموونە:

ـ مەگری مەناڵە با بە خەفەت دڵشکست نەبن

نەختێ لە لات ئەمێننەوە بۆ بەهەشت ئەچن...                    لا ١٠٤.

(نەبن) و (ئەچن) هەردووکیان چوار پیتن و لەسەر یەك کێشن، بەڵام لە پیتەکانی یەکەم و سێیەمیان لە یەکتری جیاوازن، بەمەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی)یان دروست کردووە.

ـ ئەگەر خوات ناسی بپاڕێرەوە

بە زمانی خۆت بـــــلاڵێرەوە...                    لا ٣٧٦.

(بپاڕێرەوە) و (بلاڵێرەوە) هەردووکیان نۆ پیتن، لە پیتەکانی دووەم و چوارەم لە یەکتری جیاوازن، لەسەر یەك کێششن، بەمەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی)یان دروست کردووە.

**٣ـ ڕەگەزدۆزی ناتەواوی پێچەوانەیی**: بریتییە لە بوونی دوو وشە، کە ژمارەی پیتەکان و جۆری پیتەکانیان وەکو یەکن، بەڵام شێوەی پیتەکانیان مەرج نییە وەکو یەك بن، ڕیزبوونی پیتەکانیشیان تەواو بە پێچەوانەی یەکن.. بۆ نموونە: وشەکانی: (حوور) و (رووح).. وشەکانی: (شەڕ) و (ڕەش).. وشەکانی: (کەو) و (وەك)و بەم شێوەیە.. بۆ نموونە:

**ـ بۆچی وەك کەو جنسی خۆم ڕاکێشمە ژێر داوی بەڵا**

**دانی گەنمی ناو قەفەز ناخۆم و گیاو گەپڵەم بەسە...** لا ١٠٠.

وشەکانی (وەك) و (کەو) دوو وشەنە، هەردووکیان لە ڕووەکانی جۆر و ژمارەی پیتەکانیانەوە وەکو یەکن، بەڵام شێوەی پیتەکانیان تەواو وەکو یەك نییەو پیتی (ك) لە وشەی (وەك) شێوەی کۆتایی هەیەو لە وشەی (کەو)یش شێوەی سەرەتاو ناوەڕاستی هەیە، ڕیزبوونی پیتەکانیشیان تەواو پێچەوانەی یەکە، واتە هەردوو وشەکە لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی، یان لە کۆتایی بۆ سەرەتا بیانخوێنینەوە، جارێك بە (کەو) و جارێك بە (وەك) دەخوێنرێنەوە، بەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی پێچەوانەیی) دروست بووە.

**٤ـ ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد**: بریتییە لەو ڕەگەزدۆزییە ناتەواوەی، کە دوو وشەکانی یەکێکیان بە پیتێك، یان زیاتر لە وشەکەی تر زیاترە، جا وشە زیادەکە وشەی یەکەم بێت، یان وشەی دووەم، ئەوە گرنگ نییە.. بۆ نموونە:

**ـ ئەناڵم ئەڵێم: تۆ وەك ئاوێنەی**

**بۆ شوێن دەستکردی کردگار وێنەی...** لا ١٢٤.

لەم دێڕەدا وشەی (ئاوێنە) بە دوو پیتی سەرەتای لە وشەی (وێنە) زیاترە، بەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد) دروست بووە.

**ـ ئەی برادەران با بچینە یاری**

**نەوجەوانیمان لیَ بدا دیاری...** لا ٣٥٤.

لەم دێڕەدا وشەی (دیاری) بە پیتی (د)ی سەرەتای لە وشەی (یاری) زیاترە، بەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد) دروست بووە.

**ـ کە دەڵێن ئەمرۆ دەشت و کێو شینە**

**چەندە مەڵبەندی ئێمە شیرینە...** لا ٣٥٤.

لەم دێڕەدا وشەی (شیرینە) بە دوو پیتی سێیەم و چوارەمی لە وشەی (شینە) زیاترە، بەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد) دروست بووە.

**ـ لاوانی تازەی کورد وەرن**

**بەهرە لە ژینمان وەرگرن...** لا ٣٥٤.

لەم دێڕەدا وشەی (وەرگرن) بە دوو پیتی چوارەم و پێنجەمی لە وشەی (وەرن) زیاترە، بەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد) دروست بووە.

**ـ ئەبینم هەرچی بانگی ئەکەمێ**

**دەمی گیراوە، ئاخ بۆ هاودەمێ...** لا ١١٠.

لەم دێڕەدا وشەی (هاودەم) بە سێ پیتی سەرەتای لە وشەی (دەم) زیاترە، بەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد) دروست بووە.

**- نە دەنگی دیار، نە سەدای یار بوو**

**(لیس فی الدیار) غەیرە دیار بوو...** لا ١١٣.

لەم دێڕەدا وشەی (دیار) بە یەك پیتی سەرەتای لە وشەی (یار) زیاترە، بەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد) دروست بووە.

## هونەری دووەم: لێیوەرگرتن

لە عەرەبیدا (اقتباس)ی پێدەگوترێت.. ((بریتییە لەوەی پەخشان یان شیعر شتێك لە قورئانی پیرۆز، یان فەرموودەیەکی پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) لە خۆ بگرێت، بەڵام بێ ئەوەی گوزارشت لەوە بکات، کە ئەوە لەوانە))[١٦]، دیارە مەرج لێرەدا ئەوەیە، کە وەرگیراوەکە، نابێت لە ڕستەیەکی سادە کەمتر بێت.. بۆ نموونە:

**- ﴿سبحان الذي اسرى﴾ سەراتە**

**(قاب قوسین)یش ئەدنا جێگاتە...** لا ٣٨٠.

لە نیوەدێڕێ یەکەمدا ﴿سبحان الذي اسرى﴾ ئایەتی ژمارە (١) سورەتی پیرۆزی (الأسراء)ە، شاعیر وەری گرتووەو خستوویەتییە ناو دێڕەکەی خۆی.

**- دوور لە بانگەکە ئەمەم هاتە بیر**

**﴿انکر الأصوات لصوت الحمیر﴾...** لا ٢٦٦.

﴿انكر الأصوات لصوت الحمير﴾ كه له نيوەدێڕی دووەمدا هاتووه، ئايەتی ژماره (١٩)ی سورەتی پيرۆزی (لقمان)ه، شاعير وەری گرتووه و خستويەتييه ناو دێڕەكەی خۆی.

**- نەمزانی بانی دوو هەوا تێدا**

**﴿من كل فج عميق﴾ له وێدا...** لا ٢٦٥.

﴿من كل فج عميق﴾ ئايەتی ژماره (٢٧)ی سورەتی پيرۆزی (الحج)ه، شاعير وەری گرتووەو خستوويەتييه ناو دێڕەكەی خۆی.

## هونەری سێيەم: تێكهەڵكێش

له عەرەبيدا (التضمين)ی پێدەگوترێت.. ((بريتييه لەوەی شاعير يان نووسەر وتەی بەناوبانگی بێجگەی خۆی بخاته ناو شيعر، يان پەخشانەكەی)).[17] - جا ئەو وتەيه دێڕە شيعرێك بێت، يان گوتەيەكی ئامادەی سەرزاری خەڵك، يان ئيديۆمێك، يان پەندێكی پێشينان، يان وتەيەكی ناوداران، يان چەمكێكی ئايينی، يان هەر شتێكی تر بێت. بۆ نموونه:

**- ڕۆژوو ئەگری كەچی له نوێژ بێزراوی**

**به فتوای شێخ يەكانەی دەم بەستراوی...** لا ٣٦١.

(يەكانەی دەم بەستراو) وتەی زانايانه شاعير وەكو خۆی وەری گرتووه و به دێڕەكەی خۆی تێكهەڵكێش كردووه.

لای پيرەمێرد تێكهەڵكێشی به زۆربەی ئەو وتانەی سەروو كراوه، لەوانه:

**١ـ تێکهەڵکهێشکردن بە چەمکێکی ئاینی:**

**ـ شەوێ پیاوێك لە بەفرا ما، نەمرد ئاگرێکی دووری دی**

**لەلای من نائومێدی کفرە، ئەم ئاگرەی دڵم بو کێ...** لا ٧١.

(نائومێدی کفرە) وتەی زانایانی موسڵمانە، چەمکێکی شەرعییە، کە لە سەرچاوە فیکری و فیقهییەکانی ئیسلامدا وا هاتووە. شاعیر ئەم چەمکەی بەو دێڕەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە.

**٢ـ تێکهەڵکهێشکردن بە پەندی پێشینان:**

**ـ لە زاڵم چاکە ناوەشێتەوە**

**گیا لەسەر بنجی خۆی ئەڕوێتەوە...** لا ٢١٣.

(گیا لەسەر بنجی خۆی ئەڕوێتەوە ) پەندێکی پێشینانە، شاعیر هێناویەتی بەو دێڕەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە.

**٣ـ تێکهەڵکهێشکردن بە گوتەی ئامادە:**

**ـ لە دەوری دووریيا پەستم دەروون پڕ دەرد و زووخاوم**

**ئەجەل دێ بمکوژێ نامناسێ چی بکەم نامرم و ماوم...** لا ٧٣.

(چی بکەم نامرم) لە نیوەدێڕی دووەمدا، گوتەیەکی ئامادەی سەر زاری خەڵکی کوردە، شاعیر هێناویەتی بەو دێڕەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە.

**٤ـ تێکهەڵکهێشکردن بە ئیدیۆم:**

**ـ شا بە سەپانی خۆی راناگرێ**

**ئەم سەرزەمینە بە فلسێك ناکڕێ...** لا ٣٨٥.

(شا به سەپانی خۆی ڕاناگرێ ) درکەیە (ئیدیۆم)ە لە وەسف، واتە: زۆر لەخۆی ڕازییە، شاعیر هێناویەتی بەو دێڕەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە.

**<u>٥- تێکهەڵکهێشکردن بە وتەی ناوداران:</u>**

**- سەیری ئەمانە کە، هەمووی کوردی صەف شکەن**

**گیانیان پێشکەش ئەکردو ئەیان گوت: بژی وەتەن...** لا ١٠٤.

(بژی وەتەن).. وتەی شێخ سەعیدی پیران و دکتۆر فوئاد و شێخ قادری هاوەڵیان و هاوەڵانی تریانن، کە لە ٢٤ی ئایاری ١٩٢٥ حکومەتەکەی (ئەتاتورك) بە ناڕەوا لە سێدارەی دان، ئەوان بەو دروشمەوە بەرەو پەتی سێدارە دەچوون، شاعیر هێناویەتی بەو دێڕەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە.

**<u>٦- تێکهەڵکهێشکردن بە شیعرێکی تر:</u>**

**- لە دواواندا کە یەك دەکەوی**

**وەك دوو میسرەعی فەردی مەولەوی**

**(سیروانی ئەم چەم، تانجەڕۆی ئەو چەم**

**بدەن وەهەمدا ئەم چەم تا ئەو چەم)...** لا ١٣٤.

لەم دوو دێڕەدا شاعیر هاتووە دێڕی دووەمی (مەولەوی)ی هێناوە، کە بریتییە لە:

(سیروانی ئەم چەم، تانجەڕۆی ئەو چەم

بدەن وەهەمدا ئەم چەم تا ئەو چەم)و بەو پارچەیەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە.

**٧ـ تێکهەڵکهێشکردن بە گوتەی کۆن:**

**ـ با گرتن تەمی ترسم لا نەبا**

**بریندار نەبێ شێر هەڵمەت نابا...** لا ١٠٥.

(بریندار نەبێ شێر هەڵمەت نابا) گوتەیەکی کۆنی کوردە، شاعیر وەری گرتووەو بە دێڕەکەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە.

**٨ـ تێکهەڵکهێشکردن بە وتەی نەتەوەکانی تر.. بۆ نموونە:**

**ـ واتەی (عەزیزی) دووڕو گەوهەرە**

**بەڵام کیم ئوقلەر و کیم دیکلەرە...** لا ٢٦٤.

(کیم ئوقلەر و کیم دیکلەرە) وتەیەکی تورکییە، واتە: کێ دەیبیسێ و کێ بە قسەی دەکات، شاعیر هێناویەتی بەو دێڕەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە.

**٩ـ تێکهەڵکهێشکردن بە گوتەی باوی نێو بازاڕ:**

**ـ بە عارەبی صاف، بە دەنگێکی ڕەق**

**ئەیگوت: ادخنوا من دخان الشرق...** لا ٣٨٩.

لە نیوە دێڕی دووەم (ادخنوا من دخان الشرق) وتەی ئەو منداڵە پاکەتفرۆشە عەرەبەیە، کە شاعیر لە بازاڕی بینیوە، بەم گوتەیەی پڕوپاگەندەی بۆ پاکەتەکانی خۆی کردووە، تا خەڵك لێی بکڕن، شاعیر وەکو خۆی هێناویەتی بەو دێڕەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە.

## هونەری چوارەم: هێنانەوە

لە عەرەبیدا (رد العجز عن الصدر)ی پێدەگوترێت.. لە شیعردا هەیەو لە پەخشانیش، لە شیعردا بریتییە لە بوونی دوو وشە، هاوشێوە بن، یان هاوڕەگەز، دووەمیان شوێنێکی چەسپاوی هەیە، کە کۆتایی دێڕەکەیە، هەمیشە لەوێ دەهێنرێتەوە، یەکەمیشیان دەکەوێتە سەرەتای نیوەدێڕی یەکەم، یان ناوەڕاستەکەی، یان کۆتاییەکەی، یان سەرەتای نیوە دێڕی دووەم.[١٨] بۆ نموونە:

**- ژین بۆ گەلاوێژ ببوو بە پەرژین**

**ئێستا لە دوای ئەو بێزارە لە ژین...** ل ٣٣٥.

(ژین) لەم دێڕەدا دوو جار هاتووە، یەکەمیان لە سەرەتای نیوەدێڕی یەکەم و ئەوی دووەمیشیان لە کۆتایی دێڕەکەدا هێنراوەتەوە.

**- چوومە زمناکۆ ڕاگوزەرگای لەیل**

**هیچ کەسم نەدی نە شیرین نە لەیل...** ل ١١٥.

لەم دێڕەدا وشە هێنراوەکە (لەیل)ە، وشەی یەکەمی کەوتۆتە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم و وشەی دووەمیش کەوتۆتە کۆتایی دێڕەکە، بەوەش (هێنانەوە) دروست بووە.

**- هەی نائومێدی، هەی نائومێدی**

**هەی ڕەنجەڕۆیی، هەی نائومێدی...** ل ١١٣.

لەم دێڕەشدا گرێی (هەی نائومێدی)ی یەکەم لە نیوەدێڕی یەکەم لە سەرەتاو لە کۆتاییەکەشی هاتووە، دەشێ هەریەکەیان وەربگرین، بۆ جاری دووەمیش لە کۆتایی دێڕەکە هێنراوەتەوە.

ئەم نموونانەی سەروو دیارە هەموویان هێنانەوەی (هاوشێوەیی) بوون، چونکە هەردوو ئەو وشانەی هاتوونە لە هەر دێڕێك لە شێوەدا وەکو یەك بوونە، بەڵام (هێنانەوەی هاوڕەگەزی)ش هەیە، کە شوێنی دوو وشەکانی هەر وەکو شوێنی ئەو دوو وشانەیە، کە لە هێنانەوەی (هاوشێوەیی) دەستنیشانمان کرد، بەڵام جیاوازییەکەی لەوەدایە، کە دوو وشەکانی ئێرە لە بنجدا یەك بنجیان هەیە، بەڵام لە شێوەدا وەکو یەك نین، بۆیە ناویان دەنێین (هێنانەوەی هاوڕەگەزی).. بۆ نموونە:

**- پیاوێکمان ئەمرێ تەعزێی بۆ دەگرین**

**بۆچ بۆ گەلاوێژ نەگرین تا دەمرین...** لا ٣٣٥.

لەم دێڕەدا وشەی (ئەمرێ) لە ناوەڕاستی نیوەدێڕی یەکەم هاتووەو وشەی (دەمرین)یش لە کۆتایی دێڕەکە هێنراوەتەوە، هەردووکیان یەك ڕەگەز و بنچینەیان هەیە، کە چاوگی (مردن)ە، بۆیە بەم جۆرە هێنانەوەیە دەگوترێت، (هێنانەوەی هاوڕەگەزی).

## هونەری پێنجەم: گێڕانەوە

لە عەرەبیدا (الترديد)ی پێدەگوترێت.. ((بریتییە لە بەکارهێنانی چەند جارەی وشەیەك، یان دەستەواژەیەك بەو مەرجەی هەرجارەی لە پاڵ

شتێکەوە هاتبێت)).[19] ئەمەش بە بەرچاوگرتنی ئەو وشەیەی (گێڕانەوە)کە دروست دەکات، چەند جۆرێکی هەیە، ئەوانەی لای پیرەمێرد بەدی دەکرێن، هەندێکیان بریتینە لەمانەی خوارەوە:

**<u>١ـ گێڕانەوەی ئامرازی پەیوەندی:</u>**

**ـ بە باڵی خەیاڵ بە لاف و گەزاف**

**هەڵمان ئەفڕێنن بۆ سەر کێوی قاف...** لا ١١٠.

(بە) ئامرازێکی پەیوەندییە، دوو جار لە پاڵ وشەکانی (باڵ) و (لاف) گێڕدراوەتەوە.

**<u>٢ـ گێڕانەوەی ئامرازی نەفی</u>:** ئەوەش بە پێی جۆری ئامرازە نەفییەکان زیاتر لە ژمارەیەکی هەیە، لەوانە:

اـ گێڕانەوەی ئامرازی نەفی (نە):

**ـ نە دەنگی دیار نە سەدای یار بوو**

**(لیس فی الدیار) غەیرە دیار بوو...** لا ١١٣.

(نە) ئامرازێکی نەفییە، دوو جار لە پاڵ وشەکانی (دەنگ) و (سەدا) گێڕدراوەتەوە.

ب ـ گێڕانەوەی ئامرازی نەفی (بێ):

**ـ خوای گەورەو بزورگ پادشای بێ نیاز**

**بێ هاوبەش بێ کەس بێ شوێن بێ هامڕاز...** لا ٣٧٦.

(بێ) ئامرازی نەفییە، لە نیوە دێڕی دووەم چوار جار لە پاڵ وشەکانی: (هاوبەش) و (کەس) و (شوێن) و (هامڕاز) گێڕدراوەتەوە.

**<u>٣ـ گێڕانەوەی ناو:</u>**

**ـ بەرچاو و پێڵاو هەردووکیان تەنگ بن**

**ئەبێ پێی دڵ و پێی ڕۆیین لەنگ بن...** لا ٢١٦.

(پێ) ناوێکی سادەیە، لە نیوە دێڕی دووەمدا دووجار لە پاڵ وشەکانی (دڵ) و (ڕۆیین) گێڕدراوەتەوە.

**ـ گوڵێ بەیبوون و گوڵی موفەررەح**

**بۆنیان خۆشترە لە مسکی و قەدەح...** لا ١٤٤.

(گوڵ) ناوێکی سادەیە، لە نیوە دێڕی یەکەمدا دووجار لە پاڵ وشەکانی (بەیبوون) و (موفەررەح) گێڕدراوەتەوە.

**<u>٤ـ گێڕانەوەی ئاوەڵناو:</u>** ئەوەش بە پێی جۆری ئاوەڵناوەکە زیاتر لە ژمارەیەکی هەیە، لەوانە:

أ ـ گێڕانەوەی ئاوەڵناوی ژمارەیی:

**ـ بێ گوڕەو بڕە، بێ چرپەو بێ دەنگ**

**تێکڕا لە کارن، یەك ڕەنگ، یەك ئاهەنگ...** لا ٣٧٧.

(یەك) ئاوەڵناوی ژمارەییە، لە نیوە دێڕی دووەم دوو جار لە پاڵ وشەکانی: (ڕەنگ) و (ئاهەنگ) گێڕدراوەتەوە.

ب ـ گێڕانەوە ئاوڵناوی نیشانە:

**ـ ئەم دڕك و داڵەو ئەم قەل و داڵە**

**مانەوە لە شوێن ئەو گەورە ماڵە...** لا ١٢٥.

(ئەم....ە) ئاوەڵناوی نیشانەیە بۆ تاکی نزیك، لە نیوە دێڕی یەکەم جارێك بۆ وەسفی (دڕك و داڵ) و جارێك بۆ وەسفی (قەل و داڵ) گێڕدراوەتەوە.

ج ـ گێڕانەوەی ئاوەڵناوی پرس:

**ـ ڕۆڵە بزانە ترێ چەند ڕەنگە**

**کامیان زوو ڕەزەو کامیان ئاونگە...** لا ٢٧٤.

(کام) ئاوەڵناوی پرسە دوو جار لە پاڵ وشەکانی (زوو ڕەز) و (ئاونگ) گێڕدراوەتەوە.

**<u>٥ـ گێڕانەوەی ئامرازی پەیوەندی و ئاوەڵناوی نیشانە:</u>**

**ـ های لەو خۆشییەو لەو لیقای خوایە**

**سەڵتەنەتێکی ئەو تۆی تێدایە...** لا ٣٨٥.

(لەو...ە) پێکهاتووە لە (لە)ی ئامرازی پەیوەندی و (ئەو....ە)ی ئاوڵناوی نیشانە بۆ تاکی دوور، بەڵام (ئە) بە هاتنی (لە) لە پێشیدا ون بووەو ئەوەی ماوە (و)ەکەیەتی، بەم شێوەیە (لەو....ە) دروستبووە، دوو جار بۆ وەسفی وشەکانی (خۆشی) و (لیقای خوا) گێڕدراوەتەوە.

## <u>هونەری شەشەم: پاتکردنەوە</u>

لە عەرەبیدا (التکرار)ی پێدەڵێن.. ((بریتییە لەوەی نووسەر وشەیەك، یان دەستەواژەیەك، یان ڕستەیەك بێنێ و چەند جارێك پاتی بکاتەوە، بۆ چەند مەبەستێکی تایبەتی، بەو مەرجەی لە هەموویان واتایان یەك بێت و لە

جارێکەوە بۆ جارێکی تر واتایان نەگۆڕێت)).[٢٠] بە واتە: نابێت وشەکان، یان دەستەواژەو ڕستەکان نە لە ڕواڵەت و نە لە واتادا هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا بێت.. بۆ نموونە:

**- ئای ئامان ئامان سووتام، خۆشە وەك نوقڵی بادام**

**ڕەگی ڕۆحیان دەرکێشام، لیرەکانیان دەرهێنام...** لا ٢٥٩.

(ئامان) وشەی دەربڕینی دادو شەکوای حاڵە، دوو جار لە نیوە دێڕی یەکەم پات کراوەتەوە.

پاتکردنەوە بە پێی جۆری پاتکراوەکە، واتە بە پێی کەسایەتی پاتکراوەکە، کە لە نێو ڕستەدا دەوردەبینێت، دەشێت ئەم جۆرانەی هەبێت:

**١- پاتکردنەوەی وشەی سادە**: وەکو لە نموونەکەی سەروو بینیمان (ئامان) وشەیەکی سادەبوو، دووجار پات کرابووەوە.

**٢- پاتکردنەوەی دەستەواژە، گرێ**.. بۆ نموونە:

**- هەوای هاوینە، هەوای هاوینە**

**ئەمساڵ هاوینمان زۆر لێ بە قینە...** لا ١٠٨.

(هەوای هاوینە) گرێیەکی ناوییە دوو جار لە نیوە دێڕی یەکەم پات کراوەتەوە.

**٣- پاتکردنەوەی ڕستە**.. بۆ نموونە:

**- لەژێر سەقفێکا کۆڵەکەی نییە**

**کە ڕووخا ڕووخا ڕووگیری چییە؟...** لا ٣٨٤.

ڕووخا ڕستەیەکی سادەیە، پێکهاتووە لە (ڕووخا)ی فرمانی ڕابردووی تێپەڕ و بکەرێکی ئەقڵی کە بۆ کەسی سێیەمی تاك دەگەڕێتەوە، ئەم ڕستەیە لە نیوە دێڕی دووەمدا دوو جار پاتکراوەتەوە.

**٤ـ <u>پاتکردنەوەی وشەی نەفی</u>**.. بۆ نموونە:

**ـ کە میوان هات سەری ئەبڕین گۆشتەکەی**

**نەء، نەء، توخوا بابە ئەوە قەت نەکەی...** لا ٤٠٧.

(نەء) وشەی نەفییە، لە نیوە دێڕی دووەمدا دوو جار پات کراوەتەوە.

بەڵام بە پێی ژمارەی وشە، یان دەستەواژەو ڕستە پاتکراوەکە، دەشێت پاتکردنەوەیەکی دوویی، یان سێیی، یان چواری و پێنجی و شەشی و بەم شێوەیە بە پێی مەودای دێڕەکە زۆر یان کەم بێت:

بۆ نموونە لای پیرەمێرد:

١ـ پاتکردنەوەی دوویی: بۆ نموونە:

**ـ دڵ بە پەرۆشە، دڵ بە پەرۆشە**

**خەبەرێکم بیست دڵ بە پەرۆشە...** لا ٢٥٨.

(دڵ بە پەرۆشە) ڕستەیەکە دوو جار لە نیوە دێڕی یەکەم پات کراوەتەوە.

٢ـ پاتکردنەوەی سێیی: بۆ نموونە:

**ـ ئۆف ئۆف ئۆف**

**پایز ڕەنگی ماتەمە**

**دنیا تاریك و تەمە**

**نوری چاوانم کەمە...** لا ١٠٤.

(ئۆف) وشەی حەسرەتکێشانە، لە لەتە دێڕی یەکەم سێ جار پات کراوەتەوە.

## هونەری حەوتەم: بوونی پێویستە

له عەرەبیدا (لزوم ما یلزم)ی پێدەگوترێت.. ((ئەم هونەرە واتە لە ئەستۆ گرتنی شتێ، کە پێویست نەبێ، ئەمەیش بریتییە لەوە، کە لای کەمی دوو حەرفی دوایی، لای کەمی دوو وشەی بەرانبەر، لای کەمی دوو ڕستەی بەرانبەر، وەك یەك وابن)).(٢١)

بە واتایەکی تر: بوونی پێویستە: ((بریتییە لە وەك یەکی و هاوشێوە هاتنی پیتێك، یان چەند پیتێکی بەر لەو پیتەی، کە لە هۆنراودا (سەروا) و لە پەخشاندا (سەروادار) دروست دەکات، ئەمەش (سەروا) و (سەروادار)ەکان جوان و ڕێکتر دەکات لە شێوە، بۆ سەر زار خۆشتر گۆ دەکرێن، بەر لە گەیشتنمان بە کۆتایی ڕستە، یان دێڕە شیعرییەکە، دەزانین کۆتاییان بە چی دێت)).(٢٢) بۆ نموونە:

**ـ وەنەوشە شین پۆش مل کەچ نگون سار**

**سوسەن کون کون بێ، بە نینۆکی خار**

**دەنگی کەو ببڕێت لە دەوری کۆسار**

**سروەی با نەبێ لەسەر پەلکی دار**

**ئەستێرەی سیوەیل وێنەی تازێ دار**

**ڕەشپۆش بێ شەوقی نەبینێ دیار...** لا ٣٠٤.

لەم دێڕانە هەرسێ دێڕەکانی بە وشەکانی (خار) و (دار) و (دیار) کۆتایی هاتوون، دوو پیتی دوایی هەر سێ وشەکە وەکو یەکن و بریتینە لە (ا ـ ر).

**- بە شەڕابی کەرەمی خواوە وەها مەخموورم**

**کە سەر ئازاد لە سەودایی بەهەشت و حوورم**

**مەست ئەگەر نەعرە دەکێشێ لەمەیە نەك هی خۆی**

**مەستی سەودام و چە دەربەستی مەیی ئەنگوورم**

**ئاهی من ئاگرە بۆ عەرشی خوا سەر ئەکەوێ**

**چیمە لەوەی باڵی فریشتە دەسووتێ، مەغروورم**

لەم دێڕانەی سەروو دەبینین، وشەی سەروای هەر سێ دێڕەکان بریتینە لە (حوورم) و (ئەنگوورم) و (مەغروورم)، هەر سێکیان لە سێ پیتی کۆتاییان یەکسانن، کە بریتینە لە پیتەکانی (وو - ر - م).

**- نەشئەیەك بدە بە گیانی مردووم**

**ڕووناکی چاوی هەوا کوێر کردووم...** ل ٣٦٣.

ئەم دێڕەش دوو وشەکانی کۆتاییی، کە کەتوونەتە بەرانبەر یەك بریتینە لە وشەکانی (مردووم) و (کردووم)، کە لە چوار پیتی کۆتاییان، کە بریتینە لە (ر - د - وو - م) یەکسانن.

## هونەری هەشتەم: کەرتکردن

لە عەرەبیدا (التشطیر)ی پێدەگوترێت.. ((بریتییە لەو سەروایەی، کە بە بێجگەی سەروای گشتی هۆنراوەکە، شاعیر بۆ تەفعیلەو دەستەواژەکانی نێو دێڕ و نیوەدێڕەکانی هۆنراوەکەی دادەنێت)).[٢٣] بۆ نموونە:

**- دەردی بەرتیل، ڕووی بەخیل، گاڵتەی ڕەزیل، ئەرکی دەلیل**

**دەنگی ناسازی موئەزین، برسێتی و هەوراز بەدیل...** ل ٢٩٣.

نیوه دێڕی یەکەمی ئەو دێڕە کراوەتە چوار کەرتی یەکسان و بۆ هەر تەفعیلەی سەروایەك دانراوە، بەوەش دەگوترێت (کەرتکردن).

**- هەوای تەختی سلێمانی هەیە، بادی ترین بابێ**

**بڵا بابێ، لە شەهبا بێ، لە فەیحا بێ، لە زەوڕا بێ...** لا ٦٧.

نیوە دێڕی دووەمی ئەو دێڕە کراوەتە چوار کەرتی یەکسان و بۆ هەر تەفعیلەی سەروایەك دانراوە، بەوەش دەگوترێت (کەرتکردن).

جاری واش هەیە دێڕێك دەکرێتە دوو کەرتی یەکسان و سەروای هەر چوار کەرتەکانی وەکو یەك دەبن، بۆ نموونە:

**- دڵم پیر نابێ منداڵەو ژیر نابێ**

**بۆم ئەسیر نابێ بە بەند گیر نابێ...** لا ٢٨٨.

(نابێ) لە هەردوو دێڕدا سەروای هەر چوار کەرتەکانی پێکهێناوە.

## بەشی دووەم: هونەرەکانی جوانکاری واتایی

### هونەری یەکەم: دژیەك

لای عەرەبەکان بە زاراوەکانی (الطباق والمطابقة، والتطبیق والتضاد والتكافوء) ناودەبرێت، بریتییە لە کۆکردنەوەی دوو وشە، کە ئەو وشانە لە ڕووی واتاوە دژ و پێچەوانەی یەك بن، بۆ نموونە: ڕەش و سپی، پاك و پیس، جوان و ناشرین، گەورەو گچکە، پاك و ناپاك...هتد. بۆ نموونە:

**- ئەلاوێنێتــەوە ئەگری سەری شینە لە ماتەمدا**

**شەو و ڕۆژ کۆتەڵی منداڵەکانی وا لەبەر دەمدا...** لا ٧٠.

(شەو) و (ڕۆژ) دوو وشەنە دژو پێچەوانەی یەکترین.

## جۆرەکانی دژیەك

<u>**یەکەم**</u>: بەپێی پێکهاتەی وشەیی وشە دژیەکەکان دژیەك دوو جۆری سەرەکی هەیە، ئەوانیش بریتینە لە:

١- دژیەکی فەرهەنگی (طباق الأيجاب) ئەو دژیەکەیە کە دوو وشەکان لە فەرهەنگی زمانەوە هەر یەکەو ڕەگێکی سەربەخۆیان هەبێت.. بۆ نموونە:

**- ئاخر بەهاری نەوجەوانیمە**

**ئەوەل پایزی زیندەگانیمە...** لا ٢٤٠.

(ئەووەل) و (ئاخر) دوو وشەی دژو پێچەوانەی یەکترین، هەر یەکەو ڕەگێکی سەربەخۆیان هەیە، بۆیە (دژیەکی فەرهەنگی)نە.

٢- دژیەکی نافەرهەنگی (طباق السلب) ئەو دژیەکەیە، کە دوو وشەکانی یەکیان نەفی ئەوی تریانە، واتە هەردووکیان لە فەرهەنگدا یەك ڕەگیان هەیە، نەك دوو ڕەگی سەربەخۆ.. بۆ نموونە:

**- بەند نەبووم بەند گوشاد بووم**

**قەهرەمانی دیوزاد بووم...** لا ٣٥٩.

(نەبووم) لەگەڵ (بووم) دوو وشەی دژو پێچەوانەی یەکن، هەردووکیان لە فەرهەنگدا یەك ڕیشەیان هەیە، (نەبووم) نەفیی (بووم)ەو لەسەر بنەمای نەفیکردنی ئەو دروست بووە.

لەم نموونەیەی سەروو تەنها وشە نەفیکراوەکە پێشگری نەفیی خراوەتەسەر، بەڵام جاری وەها هەیە، چ وشەی یەکەم و چ وشەی دووەمیش، واتە: وشە (ئەرێ)کەش هەر پێشگر، یان پاشگر وەردەگرێت، بۆ نموونە:

**- گیپەو کەشکەك بە ڕۆنی لەش**

**دەسدار ئەیباو بێدەس بێبەش...** لا ۳۹۲.

(دەسدار) و (بێدەس) دوو ئاوەڵناوی بکەرن، بناغەی هەردووکیان هەر وشەی (دەس)ی کورتکراوەی (دەست)ە، یەکەمیان بە هۆی پاشگری (دار) و دووەمیان بە هۆی پێشگری (بێ)وە کراونەتە دژو پێچەوانەی یەکتر، بۆیە دژیەکی نافەرهەنگییان پێکهێناوە.

**دووەم:** بەپێی بوونی ڕێزمانی دوو وشە دژیەکەکان دژیەك زیاتر لە جۆرێکی هەیە، لەوانە ئەوەی لای پیرەمێرد هاتبێت:

١- دژیەکی دوو ناو:

**- گرێی دەست بۆ دان مەهێڵەرەوە**

**شەڕ بەشی ئاشتیی تیا بێڵەرەوە...** لا ۲۱۳.

(شەڕ) و (ئاشتی) دوو ناوی دژو پێچەوانەی یەکترین، دژیەکی فەرهەنگینە، چونکە هەر یەکەو ڕەگێکی سەربەخۆیان هەیە.

**- کە ڕاست و چەپ ئەمە بێ، ڕوو لە ڕۆژهەڵات بڕۆ**

**هەموو قەومی خۆمانن، ڕەنجەڕۆن و سەرەڕۆ...** لا ۸۸.

(ڕاست) و (چەپ) دوو ناوی واتایین، دژیەکی فەرهەنگینە، چونکە هەر یەکەو ڕەگێکی سەربەخۆیان هەیە.

٢- دژیەکی دوو ئاوەڵناو:

**- ئەو ڕەنگە سوورە بوو کە لە ئاسۆی بڵندی کورد**

**مۆژدەی بەیانی بۆ گەلی دوورو نزیك ئەبرد..** لا ١١٩.

(دوور) و (نزیك) دوو ئاوەڵناون لە واتادا دژو پێچەوانەی یەکەن، هەریەکەشیان ڕەگێکی سەربەخۆیان هەیە، بۆیە ناویان دەنێین دژیەکی فەرهەنگی.

٣ـ دژیەکی دوو ئاوەڵفرمان:

**ـ لە ڕاست تەختی سلێمانی چوار پێنج ئەوەندەی مانگ**

**گلۆپی نور دەر و ژوور ڕووناك ئەکاتەوە تا بانگ...** لا ٨٨.

(دەر) و (ژوور) دوو ئاوەڵفرمانن دژیەکی فەرهەنگینە، چونکە هەر یەکەو ڕەگێکی سەربەخۆیان هەیە.

**ـ من خوار و ژوور لە دەست چووەکەی بێوڵەت خۆم، ئەوان**

**وەك خێڵێ خوار و ژوور کەری کورد! وێڵی ئاسمان...** لا ١٠٦.

(خوار) و (ژوور) دوو ئاوەڵفرمانن دژیەکی فەرهەنگینە، چونکە هەر یەکەو ڕەگێکی سەربەخۆیان هەیە.

٤ـ دژیەکی دوو چاوگ:

**ـ بوون و نەبوونم لەلا یەکسانە**

**لە وەختی غەمدا شادیم ئاسان کە...** لا ٣٦٣.

(بوون) چاوگێکە ئەرێیە، (نەبوون) نەرێی ئەوە، لەسەر بنەمای ئەو دروست بووە، بۆیە هەردووکیان یەك ڕەگیان هەیە، نەك دوو ڕەگی سەربەخۆ، بەڵام دژو پێچەوانەی یەکن، بەو جۆرە دژیەکەش دەڵێین: دژیەکی نافەرهەنگی.

٥ـ دژیەکی دوو فرمان:

**ـ دیارە کە ژن ئەوەندە هێزی نابێ، چۆن ئەبێ**

**هێندەی کە گایەك هەڵگرێ کەی هەڵمەتی ئەبێ...** لا ٢٥٣.

(نابێ) فرمانی ڕانەبردووی دانانییە، نەرێی (ئەبێ)یە، کە فرمانی ڕانەبردووی ڕاگەیاندنەو ئەرێیە، کە پێکەوە هاتوون دژیەکی نافەرهەنگییان دروست کردووە.

٦ـ دژیەکی دوو ڕستە:

**ـ هەر بەو پێو دانگە کە بۆت داناوە**

**وا دێت و دەچێ هیچ نەسوواوە...** لا ٣٧٧.

(دێت) و (دەچێ) دوو ڕستەن، لە واتادا دژو پێچەوانەی یەکن، هەریەکەشیان ڕەگێکی سەربەخۆیان هەیە، بۆیە ناویان دەنێین دژیەکی فەرهەنگی.

## هونەری دووەم: بەرانبەری

لە عەرەبیدا (المقابلة)ی پێدەڵێن.. بریتییە لە بوونی بە لانی کەم چوار وشە، دوویان لە بەشی یەکەمی ئاخاوتن و دووەکانی تر لە بەشی دوای ئەوەوە بێن، بەو مەرجەی پەیوەندی نێوان هەر وشەیەکی بەشی یەکەم و وشە بەرانبەرەکەی لە بەشی دووەمدا پەیوەندییەکی دژیەکی بێت.. بۆ نموونە:

**ـ وەك هەوری بەهار بۆ خۆی بگری زار**

**ڕۆژی ڕووناکی بێتـە شەوی تار...** لا ٣٠٤.

لە نیوەدێڕی دووەمدا لە بەشی یەکەمی گوتەکە دوو وشەی (ڕۆژ) و (ڕووناك) هاتوونە، لە پاشان بە دوای ئەوان دوو وشەی تر هاتوونە، کە بریتینە لە (شەو) و (تار).. (شەو) لە بەرانبەر (ڕۆژ) و (تار) لە بەرانبەر (ڕووناك) وەستاون، کە پەیوەندی نێوان ئەم وشانە لەگەڵ یەکتری (دژیەکی)یە، بۆیە بەمە (بەرانبەری) دروست بووە.

**ـ (قل اعوذ) تۆ بێژە**

**شەو کورتەو ڕۆژ درێژە...** لا ٣٩٥.

لێرەش لە نیوەدێڕی دووەمدا لە بەشی یەکەمی گوتەکە دوو وشەی (شەو) و (کورت) هاتوونە، لە پاشان بە دوای ئەوان دوو وشەی تر هاتوونە، کە بریتینە لە (ڕۆژ) و (درێژ).. (ڕۆژ) لە بەرانبەر (شەو) و (درێژ) لە بەرانبەر (کورت) وەستاون، کە پەیوەندی نێوان ئەم وشانە لەگەڵ یەکتری (دژیەکی)یە، بۆیە بەمەش (بەرانبەری)یەکی تر دروست بووە.

ـ کردەی تۆ و بردەی نادی مەزڵوم بێ

خراپەت دیاربێ و چاکەت بن گۆم بێ... لا ٤٠١.

لە نیوەدێڕی دووەمدا لە بەشی یەکەمی گوتەکە دوو وشەی (خراپە) و (دیار) هاتوونە، لە پاشان بە دوای ئەوان دوو وشەی تر هاتوونە، کە بریتینە لە (چاکە) و (بن گۆم).. (چاکە) لە بەرانبەر (خراپە) کە پەیوەندی نێوانیان دژیەکییە، (بن گۆم)یش لە بەرانبەر (دیار) کە پەیوەندی نێوان ئەوانیش دژیەکییە، بۆیە بەمە (بەرانبەری) دروست بووە.

## هونەری سێیەم: پێچەو پەخشە

لە عەرەبیدا (اللف والنشر)ی پێدەگوترێت.. ((ئەوەیە چەند وشەیەك بە دوای یەك بێنی و پاشان بە قەد ئەوانەوە وشەی تر بێنی، کە پەیوەندییان بە وانەی پێشەوە هەبێ، بێ ئەوەی دیاری بکەی کام وشە بۆ کام وشە دەگەڕێتەوە، چونکە خوێنەر دەتوانێ هەر وشەیەك بۆ ئەوە بباتەوە، کە پەیوەندی پێوە هەیە)).[٢٤] دیارە لێرە مەرج ئەوەیە ژمارەی وشەکانی

بەشی یەکەمی گوتەکەو ژمارەی وشەکانی بەشی دووەمی گوتەکە بە قەد یەك بن و پەیوەندی نێوانیشیان دەشێت بەیەکەوە گونجان و بۆیەك شیان و پەیوەستی و دژیەکی یان هەر پەیوەندییەکی تر بێت، بەڵام پەیوەندی نێوان هەموویان دژیەکی نەبێت، چونکە لەو بارەدا دەبێتە (بەرامبەری).. بۆ نموونە:

**- سەرو زوبانم بە فیکر و سەبات**

**هەروا بێڵەوە هەتا دێمە لات...** لا ٣٦٣.

شاعیر لێرەدا لە بەشی یەکەمی گوتەکەی وشەکانی (سەر) و (زوبان)ی هێناوە، پاشتر بە شوێن ئەواندا دوو وشەی (فیکر) و (سەبات)ی هێناوەتەوە، کە ئاشکرایە (فیکر) بۆ (سەر) دەگەڕێتەوەو لەگەڵ ئەو پەیوەندی پەیوەستی بە یەکیان هەیە. (سەبات)یش بۆ (زوبان) دەگەڕێتەوە، کە پەیوەندی نێوانیان پەیوەندییەکی بە یەکەوە هاتووییە، هەموو (زوبان)ێك دەشێت (سەبات)ی ببێ و دەشێت نەیبێت. بەمەش پێچەو پەخشەیەکی ڕێك دروست بووە.

**- بەرچاو و پێڵاو هەردووکیان تەنگ بێ**

**ئەبێ پێی دڵ و پێی ڕۆیین لەنگ بێ...** لا ٢١٦.

لە نیوە دێڕی یەکەمدا شاعیر دوو وشەی (بەرچاو) و (پێڵاو)ی هێناوە، لە پاش ئەواندا دەستەواژەکانی (پێی دڵ) و (پێی ڕۆیین)ی هێناوەتەوە، کە بە ڕیزە بۆ ئەو وشانەی پێشوو دەگەڕێنەوە، پەیوەندی نێوان (پێی دڵ) و (بەرچاو) پەیوەندییەکی پەیوەستی و پەیوەندی نێوان (ڕۆیین) و (پێڵاو) دیسانەوە پەیوەندییەکی پەیوەستییە، بەوەش دیسانەوە نموونەیەکی تری پێچەو پەخشەی ڕێك دروست بووە.

**ـ خاك و ئاو دايكن لەسەرخۆن هێمنی و ڕوونی ئەدەن**

**ئاگرو با زۆر خراپن، خيلقەتی پياو تێك ئەدەن...** لا ٢٩٠.

لە بەشی يەكەمی نيوەدێڕی يەكەم دوو وشەی خاك و ئاو هێنراون، لە پاشان لە بەشی دووەمی هەمان نيوەدێڕ دوو وشەی هێمنی و ڕوونی هێنراونەتەوە، هێمنی بۆ خاك و ڕوونی بۆ ئاو دەگەڕێنەوە، بەوەش پێچە و پەخش دروست بووە.

## هونەری چوارەم: جوانی بايس

لە عەرەبيدا (حسن التعليل)ی پێدەگوترێت.. ((بريتييە لەوەی ئەديب بە ئاشكرا، يان بە پۆشراوی هۆی زانراوی شتێك پشت گوێ بخات و بێت هۆيەكی ئەدەبی جوان بۆ شتەكە بێنێتەوە، كە گونجاو بێت لەگەڵ ئەوەی مەبەستيەتی)).[٢٥] واتە ئەو هۆيەی شاعير بۆ دۆخەكانی دێنێتەوە زادەی خەياڵی شاعيرانەی خۆيەتی، نەك هەڵقوڵاوی واقيع و ڕاستەقينە.

بە واتايەكی تر: جوانی بايس لێكدانەوەی تايبەت و شاعيريانەی شاعيرە بۆ ئەو بار و دياردانەی لە سروشت، يان لە دەوروبەری خۆی ڕوودەدەن، بەڵام بێ ئەوەی باس لە هۆيە زانستی و دروستەكەيان بكات، كە لەبەرچی وەهان، چونكە هێنانەوەی هۆی دروست ئيشی زاناكانە، نەك ئيشی شاعير. بۆ نموونە:

**ـ ئەم ئاسمانە شينە كەوا بەرگی ماتەمە**

**تەحليلی وا كراوە، كە قوببەی غەمە، تەمە...** لا ١٠٣.

لەم دێڕەدا شاعير كە باس لە ڕەنگی شينی ئاسمان دەكات، دەڵێت ئەمە لەبەر ئەوەيە، وەكو گوتوويانە: ئاسمان قوببەی غەمەو ئەو غەمە تەمێكی

گەورەی غەم و خەفەتی دروست کردووە، بۆیە وا دیارە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە لێکدانەوەی شاعیرانەیە بۆ دۆخەکە، ئەگینا هۆی ڕاستەقینەی شینی ئاسمان شتێکی ترە، ئەویش ئەوەیە، کە کوتلەیەکی غازی گەورە بەری ئاسمانی دنیای گرتۆتەوە، ئەوەیە لە دووردا بەو ڕەنگە خۆی پیشان دەدات، نەك لە واقیعدا وەها بێت.

**- ئەستێرە بەرزەکان ئەدرەوشێنەوە بە شەو**

**وەك من بە داخەوەن نە سرەوتیان هەیە نە خەو...** لا ١٠٦.

لەم دێڕەدا شاعیر باس لە (ئەستێرە بەرزەکان) دەکات، کە بە شەو دەدرەوشێنەوەو جوانن، وای لێکدەداتەوە، کە ئەوانیش چ سرەوت و چ خەویشیان نییەو وەکو شاعیر غەمبارن، بۆیە ناخەون و لە درەوشانەوەی خۆیان بۆ ساتێکیش ناکەون و هەر تیشك بڵاودەکەنەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەستێرەکان وەکو ئادەمیزاد نینە پێویستییان بە خەو و سرەوتن بێت، بەڵکو هەر سروشتی خۆیان وەهایە، تا خۆر پەنهان بێت لە زەوی، ئەوان لە دڵی ئاسماندا بەو تیشکەی لە خۆریان وەرگرتووە جوان بدرەوشێنەوە، کە خۆریش دەرکەوت، ئەوان وردە وردە تیشکەکانیان کزبێتەوە تا بگەنە ئاستی نەمان.

**- دڵسۆزی وام نەدی بوو، کە بۆم بگری وەك خەشیم**

**فرمێسکەکەی ئەوان بوو، بە ئاونگی تێگەییم...** لا ١٠٧.

لەم دێڕەدا شاعیر درێژە بە باسی ئەستێرەکان دەدات، کە لە دێڕەکەی پێشووش باسی کردبوون، دەڵێت: هێندە بەزەییان بە من هاتۆتەوە، شەو تا بەیان بە غەشیمی بۆم دەگریان، ئەوەتا ئەو دڵۆپە ئاوانەی بە (ئاونگ)یان تێگەییم، ئەوە فرمێسکی ئەوانە نەك ئاونگ، ئەوەش دیارە لێکدانەوەی

شاعیرانەیە، ئەگینا ڕاستەقینە نییە، ئاونگ لە فرمێسکی ئەستێرەکان دروست نابێت، چونکە ئەستێرەکان گریانیان نییەو فرمێسکیان لێ بەرنابێتەوە، بەڵکو دروستبوونی ئاونگ مەسەلەیەکی دیکەیە، پەیوەندی بە شێ و هەواوە هەیە، بۆیە لە هەندێ وەرزدا بەیانییان ڕووەك ئەو ئاونگانەیان لەسەر گەڵاکان دروست دەبێت.

**ـ پیرێژنێکە هەر شەوەی شوویەك ئەکا بە خەڵق**

**سووراو بە خوێنی مێردی ئەکا، پێی ئەڵێن شەفەق...** لا ١٠٣.

لەم دێڕەدا شاعیر دەڵێت دنیا هەر شەوەی شوو بە یەکێك دەکات، بەرەبەیان خوێنی دەڕژێت و بەوەیە سووریەکەی ڕوخساری دەردەکەوێت، خەڵك نازانن، دەڵێن: ئەوە شەفەقە.

لە ڕاستیشدا سوورایی شەفەق بەو هۆیەوە دروست نابێت، دنیا چ مێردێکی نییەو کەس ناکوژێت، بەڵکو بە هۆی دەرکەوتنی خۆرێکی نوێوە ئەو سوورایییە دەردەکەوێت و دیمەنێکی جوان دەبەخشێت، بەڵام لێکدانەوەکەی شاعیر لێکدانەوەیەکی جوانبینییانەی شاعیرانەیە.

**ـ گوڵاڵە بە ڕەنگ سوور ئەکاتەوە**

**وەك من داغدارە لە بنیاتەوە...** لا ١٠٥.

شاعیر دەڵێت گوڵاڵە بۆیە ڕەنگی سوور دەچێتەوە، چونکە لە بنجدا وەکو من داغدارە، لە ڕاستیشدا گوڵاڵە لەبەر چ داغێك ئەو ڕەنگەی نەگرتووە، بەڵکو ئەقڵی نییە داغ بۆ هیچ هۆیەك هەڵبکێشێت، بەڵام هەر ڕەنگی ئاسایی خۆی وەهایە، کەچی شاعیر وەکو ئادەمیزاد تەماشای دەکات، دەڵێت: چۆن من کە غەم دامدەگرێت سوور دەبمەوە، گوڵاڵەش کە سوورە هەر بەو هۆیەوەیە، کە غەم دایگرتووە.

**- ئاهو نزای کوردەکانی شیمال گەییە ئاسمان**

**بەو دووکەڵی هەناسەیە، ئاو دێ لە دیدەمان...** لا ۱۰۷.

شاعیر دەڵێت بەو دووکەڵی هەناسەیە، کە لە سینەی کوردەکان دەرچوو، چاومان برژایەوەو ئاوی لێ هات، بەڵام لە ڕاستیدا دووکەڵ لە سینە دەرنایەت و چاو بەوە نابرژێتەوە ئاو دەربدات! بەڵکو گریانەکە بە هۆیەکی تر دەبێت، ئەویش ئەوەیە، کە مرۆڤ لە کاتی بریندارببوونی هەستی و هەڵقوڵانی سۆزی جا بە هەر هۆیەکەوە بێت گریانی دێت.

**- بڕوانە ئاسمان بووەتە پەلکی زەرد و سوور**

**گیانی زەهاوییە، کە ئەدرەوشێتەوە لە دوور...** لا ۳۱۲.

شاعیر باس لە پەلکەکانی پەلکەزێڕینە دەکات، دەڵێت ئەو پەلکانە گیانی (زەهاوی)نە لە دوورەوە دەدرەوشێنەوە، ئەوەش ڕاستەقینە نییەو خەیاڵی شاعیرانەیە، چونکە لە ڕاستیدا گیان لە جیهانی هەستپێکراوەکان نییەو نابینرێت، بەڵام خۆشەویستی شاعیر بۆ (زەهاوی)، ئەوە وای لێدەکات ئەو پەلکانەی پەلکەزێڕینە، کە لە دوای باران لە هەندێ کاتی تایبەتدا دروست دەبن، ئەو لێکدانەوەیان بۆ بکات و بەوەش بییەوێ بڵێ: ئەوە زەهاوی هەر زیندووەو ئەوەتا لەوێوە پێمان پێدەکەنێت.

**- گوڵە بەڕۆژە عاشقی تەواوە**

**ئەسووڕێتەوە ڕوو لە هەتاوە...** لا ١٤٤.

شاعیر دەڵێت: گوڵەبەڕۆژە بۆیە هەمیشە ڕووی لە هەتاوەو لەگەڵ ئەو دەسووڕێتەوە، چونکە عاشقیەتی و عاشقی تەواویش کاری وەها دەکات، بەڵام ئەوەش ڕاستەقینە نییە، چونکە گوڵەبەڕۆژە لەبەر ئەو هۆیە نییە، کە

ڕووەو خۆر دەسووڕێتەوە، بەڵکو سووڕی ژیانی خۆی وەهایەو خودا بەو شێوەیەی ژیان بۆ داناوە.

## هونەری پێنجەم: ڕێبازی گوتەیی

لە عەرەبیدا (المذهب الكلامي)ی پێدەگوترێت.. لەلای (ئیبنول موعتەز) بە هونەری پێنجەمی (جوانكاری) دانراوە، (ئیبن و ڕەشیق) لە بەشی دووەمی كتێبەكەی خۆیدا (العمدة) دەڵێت: ((ڕێبازێكی گوتەیی فەلسەفییە))[٢٦]، (زەركەشی)ش دەڵێت: ((بریتییە لە پاساوهێنانەوە بۆ واتای مەبەست، بە پاساوێكی ئەقڵی وەها هیچ لاملێییكردنێك بۆ خۆی نەهێڵێتەوە)).[٢٧]

لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕایانەش دەتوانین بڵێین: بریتییە لەوەی شاعیر، یان نووسەر لەسەر شێوازی كەلامییەكاندا بەرگری لەو بیرەی خۆی بكات، كە پێشكەشی دەكات و بەرگریكردنەكەیشی لە بیرەكەی خۆی بە بەڵگەی ئەقڵی وەهابێت، بەرانبەر چ بیانووێكی بۆ نەمێنێتەوەو یەكسەر بڕوای پێ بكات.

لای پیرەمێردی شاعیر نموونەی وەها لە گەلێ لە دێڕەكانی بە دیار دەكەون، بۆ نموونە:

**- چاوم هەڵبڕی ئاسمانم دی**
**گوتم: بێ وەستا نەهاتۆتە دی**
**ئەگەر كردەوەی بێگانە بووایە**
**خۆ ئەشیا بێ ستوون ڕانەوەستایە**

**دیارە هەر چەرخێك پیاو دروستی كا**

**كاتێكت زانی سوواو تێك شكا...** لا ٣٧٦.

شاعیر لێرەدا باس لەوە دەكات، كە ئەم ئاسمانە بێ خاوەن خەڵق نەبووە و ئەوەی خەڵقیشی كردووە زۆر ئەفرایندەو بەدیهێنەرێكی گەورەو بە توانا بووە، چونكە ڕاگرتنی ئەو ئاسمانە گەورەو فراوانە بەبێ ستوون، ئەمە كارێكە ئەقڵ قەبوڵی ناكات هیچ مرۆڤێك هەبێت لەسەر پشتی ئەو زەوییە پێی بكرێت، تەنانەت ئەو كارانەیش كە ئادەمیزاد دەیانكات، بە زوویی تێكدەچن، بەڵام كە ئەو كارەی خوا هەزارەها ساڵە بەو تەواوییە وەكو خۆی ماوە، ئەوە بەڵگەیەكی ترە لەسەر خالقیەت و تواناداری خوا لەو بارە.. واتە: ئەو كارەی ڕاگرتنی ئاسمانەكان بێ هیچ كۆڵەگەو ستوونێك، كارێكە هەر لە خوای تەنیا دەوەشێتەوە، لەبەر ئەوەی خاوەنی سیفاتی (قودرەت و كەماڵ)ەو لە هەموو شتێكدا تەواوە.

**- ئەبێ بەخشندە مل كەچ كا لە ڕاستی مووچەخۆری خۆی**

**سوراحی سەر فرودێنێ لە بۆ پیاڵە، كە تێی كا بۆی...** لا ٧٢.

شاعیر ئەم شیعرەی بۆ (شێخ مەحمود) ناردووە دوای ئەوەی شێخ چەند مانگێك لەسەر شیعرێكی تری لێی توورە بووە و نەیهێشتووە بگاتە لای، (پیرەمێرد)یش ئەوەی بەلاوە قورس بووە، هاتووە بەو شیعرەی دڵی چاك كردۆتەوە، بە بەڵگەی ئەقڵی تێی گەیاندووە، كە بۆ ئەو گونجاو نییە لە كەس توورەبێت، بەڵكو دەبێت خاوەنی لێبووردن بێت لەگەڵ هاووڵاتیانی خۆی.. بۆیە لەو دێڕەی سەروو نووسیویەتی: كەسی گەورە دەبێت لەگەڵ بچووكی خۆی لێبووردە بێت، چاوپۆشیكەر بێت، هەمیشە كۆمەكی بكات، نەك پەڵپی لێ بگرێت و حسێب بۆ هەڵەكانی بكات. بەڵگە ئەقڵییەكەیشی

ئەوەیە، کە دەڵێت: ئەدی ئەوە نییە سوراحی بەو گەورەییەی خۆی بۆ بەرداخێکی بچووك مل شۆڕ دەکاتەوە تا پێی ببەخشێت و لێیشی بێزار نابێت؟!

دوای ئەوە درێژە بەو بیرەی دەدات و دەڵێت:

**- کە ئاو داری لەسەر راگرتووە ئەیزانی چی تیایە**

**لە لای نەنگە کە پەروەردەی نقوم کا گەورەیی وایە...** لا ٧٢.

ئەوەتا ئاوی دەریایەك چەندەی گەورەیە بەلاوەی نەنگە دارێکی بچووك لەسەر پشتی خۆی وەلانێ و نقومی بکات، دەی گەورەیی وایە، ئەی تۆ چۆن دەبێ تووڕە بیت؟!

**- لقی شۆڕی درەخت میوەی ئەخۆن بێ ئەرکی بەرد و دار**

**پەلی بەرد بۆ پەلی بەرزە، لەقەش بۆ سەر پەلی بەردار..** لا ٧٣.

شاعیر بەردەوام دەبێ لەسەر بەڵگە ئەقڵییەکانی وەکو چۆن کەلامییەکان وەها پاساو بۆ ڕاکانی خۆیان دێننەوەو بە شێخ دەڵێت: لقە شۆڕەکانی درەخت خەڵك پێویستییان بەوە نییە دار و بەردی تێ بگرن، هەر خۆیان دەستیان پێی دەگات و بەروبوومەکەی دەخۆن، بەڵام پەلی بەرد بۆ پەلی بەرزەو لەقەش بۆ سەر ئەو پەلانەیە، کە بەردارن و بەرزن، دەستی خەڵکی ئاسایی پێیان ناگات، ئەدی چییان لێ بکات؟! واتە شاعیر دەڵێت: تۆ پەلێکی بەرزی، خۆ پەلێکی نزم و ئاسایی نیت، بەرژەوەندی خەڵکیت لەلایە، ئەی چۆن خەڵك بۆ زامنکردنی ئەو بەرژەوەندییانەیان بەر پلارو شتی دیکەت نادات؟!

لە دێڕێکی تر شاعیر ڕووی ئامۆژگاری دەکاتە یەك لە دۆستانی و پێی دەڵێت:

**- دوو گوێ و زوبانێك دراوە بە تۆ**

دوو ببیەو یەکێك بڵێ لەسەر خۆ... لا ٢١٤.

واتە بۆیە دوو گوێ و یەك زوبانت پێدراوە، بۆ ئەوەی دوو قسە ببیسی و یەك قسە بکەیت، ئەدی نابینی خودا وەهای خەڵق کردووی؟! ئەدی کەوابێت بۆ وەها نەکەیت؟!

ئەم بەڵگانەی هەموو ئەو دێڕانەش، بەڵگەی ئەقڵی شاعیرن، بەرانبەر دەخەنە ئەمری واقیع، ناتوانێت ملکەچییان نەکات.

## هونەری شەشەم: پۆشین

لە عەرەبیدا (التورية)ی پێدەگوترێت.. ((بریتییە لە پەیوەندی دروستکردن لە نێوان دوو شت، یەکیان واتایەکی دووری هەبێ و ئەوی تریان واتایەکی نزیك، بەڵام لە دەقەکە مەبەست واتا دوورەکە بێ))[٢٨]، بە واتا پۆشین ((پیشەیەکی قەشەنگە لە پیشە ڕەوانبێژییەکان، مانای ئەوەیە، کە هۆنەر، یان نووسەر وشەیەك بێنێت، ئەو وشەیە دوو واتا بگەینێت، یەکێ دوور و یەکێ نزیك، کە دەڵێین دوور مەبەست ئەوەیە پیاو درەنگ بۆی دەچێ، نەختێ لێکدانەوەی پێ دەوێ، بەڵام کە دەڵێین مانایەکی نزیك، مەبەست ئەوەیە، کە گوێگر یان خوێنەر هەر زوو بۆی دەچێ و وەری دەگرێ، جا مەرجە لە پۆشین هۆنەر یان نووسەر مەبەستی بەم وشە جووت واتایە، واتا دوورەکە بێت)).[٢٩]

ئەمەش بە لانی کەم سێ جۆرێکی هەیە، لای پیرەمێرد دوومان بەدی کردوون، کە بریتینە لە:

**١- پۆشینی ڕووت:**

((بریتییه له به تەنیا هاتنی ئەو وشەیەی که (پۆشین)ەکەی لێ دروست دەبێت، بەو شێوەیەی که هیچ هێماو ئاماژەیەکی له تەك نەهاتبێت، ئەوە بخاته ڕوو مەبەست واتا نزیکەکە، یان دوورەکەیە))[٣٠]، بۆ نموونە:

**- پیاوێکمان ئەمرێ تەعزێی بۆ دەگرین**

**بۆچ بۆ گەلاوێژ نەگرین تا دەمرین...** لا ٣٣٥.

لەم دێڕەدا وشەی (گەلاوێژ) دوو واتای هەیە، واتایەکی نزیك که ئاشکرایه (ژنێکه بەو ناوەو مردووە)، که خوێنەر هەرکه دێڕەکه دەبیسێت، مادام باسی مردنەو باسی تازیەی پیاوانە، بیری بۆ ئەوە دەچێت، ئەی بۆچ جیاوازی له نێوان پیاو و ژن بکەین و بۆ بۆ گەلاوێژیش هەمیشه تازیه بار نەبین؟! بەڵام (گەلاوێژ) واتایەکی پۆشراو و دووریشی هەیە، شاعیر مەبەستی ئەوە، که ئەویش (گۆڤاری گەلاوێژ)ە، واته ئەی بۆچی بۆ داخرانی (گەلاوێژ)ی گۆڤاریش که ئەویش کەسایەتییەکی مەعنەوی هەیە، وەکو پیاو کەسایەتییەکی مادیی هەیە، بۆ بۆ ئەویش تا مردن تازیەدار نەبین، خۆ له پیاوێك کەمتر نییه!

لەم دێڕەدا ئەو وشەی (گەلاوێژ)ە، که پۆشینەکەی دروست کردووە، هیچ نیشانەیەکی لەگەڵ نییە، که مەبەست لێی واتا دوور یان نزیکەکەی بێت.

**٢- پۆشینی پاڵاو:**

((بریتییه لەو پۆشینەی، که له تەك ئەو وشەیەی که پۆشینەکەی لێ دروست دەبێت، وشەیەکی تر هاتبێت، وای دەربخات، که هێمایه بۆ واتا نزیکەکە، ئەمەشیان هەر بۆ ئەوەیە، تا زیاتر بیرو هۆشی گوێگر بۆ لای مانا نزیکه نامەبەستەکه بچێت و زەین و هۆشی له مانا دوورە مەبەستەکه دوور

بکەوێتەوە))[٣١]، بۆ نموونە:

**- (ئیبراهیم) لە ناو (نار)دا سووتاوە**

**سەجادەی تەقوا بێ ڕایەڵ ماوە...** لا ٣٣٥.

لە نیوە دێڕی یەکەم باس لە (ئیبراهیم) کراوە، کە وشەیەکە پۆشینەکەی دروست کردووە، وشەی (نار)یشی بە دوادا هێنراوە، تا زیاتر خوێنەر بۆ مانا نزیکەکە ببات و لە مانا دوورە مەبەستەکەی دووربخاتەوە، کە مانا نزیکەکەش ئەو باسەی لە ئاگر خستنی حەزرەتی (ئیبراهیم) پێغەمبەرە (درووددو سڵاوی خوای لەسەر) کە کاتێك درۆکانی (نەمروود)ی ئاشکراکرد و لە پێش چاوی ڕاوێژکار و وەزیر و میللەتەکەی بۆی ڕوون کردەوە ئەو بە تەنیا مرۆڤێکەو دەسەڵاتی دیاری کراوە، ناتوانێت ژیان و مەرگ بە کەس ببەخشێت، چونکە ئەوە ئیشی خوایە، نەك هی بەندە، (نەمروود)یش لێی تووڕەبوو و بڕیاری ئەوەی دا بیخەنە ناو ئاگر، بەڵام خوای گەورە لەبەر هەڵوێستی زۆر جوانی ئەو پێغەمبەرە لە ئاگری ڕزگار کرد و بە ئاگرەکەی فەرموو ﴿یا نار کوني بردا وسلاما علی ابراهیم﴾.. واتە: ئەی ئاگر ساردبەو سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم.. ئەو ڕووداوەش قورئانی پیرۆز تۆماری کردووە، بۆیە کە شاعیر ئەو وشانەی (ئیبراهیم) و (نار) بەکاردێنێت، یەکسەر خوێنەر بیری بۆ ئەو مانا نزیکە دەڕوات، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو مانایەشی مەبەست نییە، بەڵکو مەبەستی لە (ئیبراهیم) سەرنووسەری گۆڤاری (گەلاوێژ)ە، کە (ئیبراهیم ئەحمەد)ە، لە وشەی (نار)یش مەبەستی ئاگری ئازاری داخستنی گۆڤارەکەیەتی، کە پێوەی دەسووتێت، بەم شێوەیەش (پۆشینی پاڵاو)ی جوان و سەرنجڕاکێش دروست بووە.

لە نیوە دێڕی دووەمیشدا ئاماژەی بە (سەجادە) کردووە، کە مانا نزیکەکەی

(بەرماڵی نوێژو خواپەرستییە)، بە وشەی (تەقوا)ش زیاتر زەینی خوێنەری هەر بۆ ئەو مانا نزیکە ڕاکێشاوەو دووری خستۆتەوە لەوەی بەلای مانا دوورەکەی دێڕەکە بچێت، کە مەبەست لێی (عەلائەدین سەجادی)ی نووسەری دووەمی ئەو گۆڤارەی (گەلاوێژ)ە، لێرەشدا دیسانەوە (پۆشینی پاڵاو)ی دروست کردووە.

## هونەری حەوتەم: جێگۆڕین

لە عەرەبیدا (العکس)ی پێدەگوترێت.. ((بریتییە لەوەی گوتە چ لە سەرەتاوە تا کۆتایی وشەکانی بخوێنرێتەوە، چ لە کۆتایی بۆ سەرەتا وشەکانی بخوێنرێتەوە هەر هەمان شت دەربچێت))[٣٢]، بۆ نموونە:

**- عەشق و جوانی لەسەر من و تۆدا کەوتە ڕوو**

**من بەختی تۆم خەوم نییە، تۆش بەختی من بنوو...** لا ٢٩٤.

لەم دێڕەدا لە نیوەدێڕی دووەم سەرەتا (من بەختی تۆم) هاتووە، لە پاشان شاعیر جێگۆڕکێی بە وشەکانی ئەو ڕستەیەی کردووەو گوتوویەتی: (تۆ بەختی من)ی، کە هەردوو ڕستە ئەگەر یەکەمیان لە سەرەتاوە بخوێنیەوەو دووەمیان لە کۆتاییەوە هەر یەك شت دەردەچن، یانیش ئەگەر دووەم لە سەرەتاو یەکەم لە کۆتایی بخوێنیەوە دیسانەوە هەر یەك شت دەردەچن، بەوەش شاعیر (جێگۆڕین)ی دروست کردووە.

## هونەری هەشتەم: هێماکەر

لە عەرەبیدا (الأرصاد) و (التسهیم)یشی پێدەگوترێت، بریتییە لەوەی بەر لە کۆتایی نیوەدێڕ یان دێڕەکە، شتێك بگوترێت، ئەگەر ئەو بیسترا، بزانرێ

ئەوەی بە دوایدا دێت چییە.[٣٣] ، بە واتە: ((قسەکەر لە سەرەتاوە قسەیەکی وا بکات، ئەوە بگەیەنێ، کە لە دوایی قسەکەوە چی ئەڵێ، یا لە سەرەتای پارچە پەخشانێکەوە شتێکی وا بڵێ، ئەوە بگەیەنێ، کە لە دوایەکەیشیەوە چی ئەڵێ))[٣٤]، بۆ نموونە:

**- بەهەشت مەدح ئەکەن بە ناو و داوێ**

**من لیقای تۆم بێ بەهەشتم ناوێ...** ل ٣٧٨.

شاعیر لەم دێڕەیدا موناجات لەگەڵ خوای گەورەدا دەکات، دەڵێت: خەڵك مەدحی بەهەشت دەکەن، کە چەند خۆش و بەناو بانگە، بەڵام من لیقای تۆم هەبێت، بەهەشتم ناوێت. لێرەدا (من لیقای تۆم بێ) هێماکەرە بۆ ئەوەی بڵێ: (بەهەشتم ناوێ)، چونکە مادام بەراورد لە نێوان (لیقای خوا) و (بەهەشت) دەکرێت، شاعیر گرنگی بە یەکەمیان دەدات، کە دەستی بکەوێت، ئەوە بێگومان بەر لەوەی دێڕەکەی تەواو بکات، خوێنەر دەزانێت لەو بارەدا لە دوای (من لیقای تۆم بێت)دا دەڵێت (بەهەشتم ناوێت)، چونکە ڕستەی یەکەمی (من لیقای تۆم بێت) هەر ئەوە لە زەیندا دروست دەکات.

**- پیاو دائەنیشێ و ژنان دەگەڕێن**

**شەرم نامێنێ ژن و پیاو هاوڕێن...** ل ٢٥٧.

لە نیوە دێڕی یەکەمدا مادام بەراورد لە نێوان (ژن) و (پیاو) دەکرێت لەسەر دانیشتن و کارکردن، بێگومان ئەگەر پیاو دابنیشێ، کەوابێت ژن دەبێت بگەڕێن، چونکە ڕستەکان ببەیە باری ڕستەی مەرجییەوە ئەو چەمکەت لەلا دروست دەبێت، دەی مادام شاعیر دەڵێت (پیاو دائەنیشێ)، بێ ئەوەی تەواوی بکات، خوێنەر دەزانێت، کە ئێستا دەڵێت (ژن دەگەڕێن)، چونکە

ڕستە یەکەمەکەی (پیاو دائەنیشیٚ) هێماکەرە بۆ ئەو ڕستەی دووەمە، کە هەر زوو لە زەینی خوێنەردا دروستی دەکات.

**- دەوڵەمەند زەکات نادەن بە ئیحسان**

**ڕاستی نامێنیٚ زۆر ئەبیٚ بوختان...** لا ٢٥٧.

لە نیوە دێڕی دووەمدا دیسان بە هەمان شێوە مادام ڕاستی نەمێنیٚ، دیارە درۆو بوختان زۆر دەبن، بۆیە بەر لەوەی شاعیر بڵێت (زۆر دەبێت بوختان) هێشتا هەر قسەی یەکەمی کردووە، خوێنەر بیری ئەوەی بۆ دروست بووە، کە ئێستا دەڵێت (زۆر دەبیٚ بوختان).

**- جەهلە تاریکە شەوی کورد**

**خوێندنیش تیشکی هەتاو...** لا ٢٨.

لەم دێڕەشدا بە هەمان شێوە، مادام جەهل و خوێندەواری دژیەك بن، کەوابێت ئەگەر جەهل تاریکە شەوی کورد بێت، ئەوا بێگومان خوێندەواریش تیشکی هەتاویەتی، بۆیە بەر لەوەی شاعیر نیوە دێڕی دووەم بڵێت، هەرکە نیوە دێڕی یەکەمی دەخوێنتەوە، خوێنەر بیری بۆ ئەوە دەچێت، کە ئێستا چ دەڵێت، چونکە ڕستەی یەکەمی هێماکەرە بۆ ئەوەی دووەمی، هەر ئەو دوو شتەش هەنە، لە پێچەوانەی یەك بێن، چونکە شتەکان لە باری بەیەکدژیدا هەر دوو دژن بەیەکتر نەك زیاتر.

## هونەری نۆیەم: لە یەکچوونی لایەکان

لە عەرەبیدا (تشابه الأطراف)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لەوەی گوتە بە شتێك کۆتایی پیٚ بهێنرێت، کە لەگەڵ سەرەتاکەی لە واتادا گونجاوییەکیان

لە نێواندا هەبێت.[٣٥] وەکو لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: ﴿لا تدركه الأبصار وهو يدرك الأبصار وهو اللطيف الخبير﴾.

**- هێندە شیرینم شانەی هەنگوینم**

**پێی عاشق وەك مێش پێکا ئەڵکێنم...** لا ٢٩٨.

شیرینی لە سەرەتای ئەم دێڕەدا هاتووە، لە کۆتایی دێڕەکەش بەیەکەوە لکاندن هاتووە، دیارە ئەوەش هەر لەگەڵ شیرینییەکە لەیەك نزیکن و هەمان شتن، چونکە شیرینی ئەو سیفەتەشی هەیە کە شتەکان بە یەکەوە ئەلکێنی.

## هونەری دەیەم: گردکردنەوە

لە عەرەبیدا (العقد)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لەوەی، کە پارچەیەك پەخشان بهۆنیتەوەو بیکەی بە شیعر، بە مەرجێ هەموو، یان زۆرتری وشەکانی ئەو پارچە پەخشانە وەرگری و بیخەیتە ناو شیعرەکەتەوە، کەواتە ئەتوانی کەم و زیاد لە شیعرەکەتا بکەیت و خۆت نەبەستی بە وشەکانی پارچە پەخشانەکەوە)).[٣٦] بۆ نموونە:

**- سوحبەتی نادان تاڵ ڕابواردنە**

**لە دوای کەر ڕۆیین تەرس بۆنکردنە...** لا ٢١٣.

نیوە دێڕی دووەم (لە دوای کەر ڕۆیین تەرس بۆنکردنە) لەو پەندە پێشینانە گرد کراوەتەوە، کە دەڵێت: (ئەوەی لە دوای کەرێ بڕوات، هەر تەرس بۆنکردنی بۆ دەمێنێتەوە). شاعیر ئەو پارچە پەخشانە بچووکەی گرد کرۆتەوە و بەو جۆرە بە پوختی خستویەتیە نێو دێڕەکەی خۆی، واتە لە ژمارەی وشەکانی کەم کردۆتەوە، بەڵام پارێزگاری لە واتاکەی کردووەو وەکو خۆی هێشتوویەتییەوە.

## جۆرەکانی گردکردنەوە

بەپێی ئەو پارچە پەخشانەی شاعیر وەری دەگرێت و لە شیعرێکی گردی دەکاتەوە، دەشێت ئەم جۆرانەی گردکردنەوە هەبن:

١- گردکردنەوەی پەندێکی پێشینان.. بۆ نموونە:

**- لە پردی نامەرد مەپەڕەرەوە**

**جەردە ڕووتت کا با لەو بەرەوە...** لا ٢١٤.

(لە پردی نامەرد مەپەڕەرەوە) لەو پەندە گرد کراوەتەوە، کە دەڵێت: (نامەرد ئەگەر بووە پردیش، بەسەریدا مەپەڕەوە)، شاعیر هەمان مانای پەندەکەی بە پوختتری خستۆتە نێو دێڕەکەی.

٢- گردکردنەوەی حاڵەتێکی واقیعی، یان کورتیلە چیرۆکێك.. بۆ نموونە:

**- خۆی پێوا گوتی باڵا شەش گەزم!**

**سەیرم کەن ئەزم وا هەڵدەبەزم؟!...** لا ٢١٧.

ئەم دێڕە لە حاڵەتی ئەو کەسە گرد کراوەتەوە، کە: کەسێکی بێدەسەڵاتە، ڕۆژێکیان بە تەنیا دەبێت و بێ ترس بە ڕێدا دەڕوات، زۆر خۆش دەڕوات و بەمە هەوایەکی دەچێتە ناو قەلبی، شانازی بە خۆ دەکات و دەڵێت: ئەوە ئەزم؟! وا دەبەزم؟! شاعیر ئەو حاڵەتە کۆنەی ئەدەبی فۆلکلۆر و سەرزاری خەڵکی هێناوەو لەو دێڕەی خۆیدا گردی کردۆتەوە.

٣- گردکردنەوەی حەکایەتێکی فۆلکلۆری، یان میللی، یان چیرۆکێکی هونەری، یان هەر پارچە پەخشانێکی دیکە.. بۆ نموونە:

**- خدر بوو پیـاوی حـەسەن ئەفــەندی**

**کەس پێی نە ئەوت کەرت بــە چەندی**

**کـوێخا دەرگابوو جێی خواجــا نشین**

فـەڕەنجی پۆش بوو زستـان و هـــاوین
ڕەنجبەری ماڵێك ڕۆژێك نەخۆش کـەوت
نـاچار ئەو ڕۆژە بێگـاری بــــەرکـەوت
پێنج کــەری ئەبـرد بۆ دێی کــەڵەگــن
کـــە لەسەر خەرمان کای بـۆ دابگــرن
لە ڕێ خۆی سواری یەکێکیان بووبـوو
کـە ئەی ژماردن هەر چواریان مــابوو!
وتـی: ئای خۆ من پێنج کــەرم پێ بوو
وا چواریان دیارە ئەوی تر کوێ چوو؟!
ڕووانـی بـۆ دواوە هیچ دیــار نـەبـــوو!
گـــەڕایـەوە لای کـــەران زوو بــــە زوو
کــــە تــەماشای کـرد پێنج کەر تەواوە
لــەم فـەن و فێڵە سەری ســوڕمــــاوە
زۆر مــــاندوو بووبوو دیسان سوار بۆوە
لـــــە بــــەرەوژێرە سەرەوخــوار بۆوە
دیسان کــــە ڕووانی کەر چواریان ماوە
گــریا، گوتی: من چیم لێ قەومــاوە؟!
خــۆی خستـە خــوارێ بە دوعــا و نـزا
ئــەپـــــاڕایـــەوە لـــە بارەگای خوا
دوعـــای گیـــرابوو، ڕوانی کــەر پێنجە
ڕزگـــــاری بووبوو لـەم دەردو ڕەنجە
ئیتر نــــــەیتوانی بڕوات بــە پێیـــان

**خۆی هـــەڵدایە سەر کـــەرێکی تریان**

**دووبـــــارە بـەزمی لێهاتـــــەوە دی**

**وتـــی: ئەمجـارە کەرە گورگ خواردی**

**هـــەروا لێی خوڕی گـــەییە نیـــوە ڕێ**

**بەرەو پیری هـــات خلـــەی کوێخا دێ**

**بانگـــی کرد: کوێخا لە دەورت گـەڕێم**

**لە کوێ خوا وا تۆی هێنایـە سـەر ڕێم**

**ئـــــــەمڕۆ جنۆکە گاڵـەم پێ دەکەن**

**جـــارێ کـــەرێکم ئـــەدزن و ئەیبەن**

**وتـــــی: خدرئاغا چەند کەرت پێ بوو؟**

**چەندەیان ماون و چەندت لە کیس چوو**

**وتـــی: پێنج کـــــەرم هێنا بوو لە شار**

**کـــــە ئەیژمێرم هـــاتۆتە سـەر چوار**

**کوێخا تێگەیشت، کـە گونی و گـێزەر**

**لێك نـاکاتەوە کـابرای قـوڕ بـە سەر**

**ئەو کەرەی کـــەوا خۆی سواری بووە**

**چونکـە نـــاییبینێ لـــە بیری چـــووە**

**وتـــی: دابـــەزە هـەی بـەندەی بێغەش**

**پێنجی بۆ ژمارد خۆشی کرد بە شەش! !...** لا ۳۹۰و۳۹۱.

ئەم چیرۆکە شیعرە لە حەکایەتێکی (جوحا)، یان (مەلا مەشوور) وەرگیراوە، شاعیر حەکایەتەکەی هێناوەو بە شیعر گردی کردۆتەوە، بەڵام لێرەدا زیادیشی خستۆتە سەر، بۆ ئەوەی مەبەستەکانی خۆی باشتر بپێکێت.

له حەکەیاتەکەی (مەلا مەشوور)دا هاتووە: (... ڕۆژێکیان مەلا مەشوور بەرەو بازاڕ چوو و شەش کەری پێ بوو، پاش ماوەیەك ماندوو بوو، سواری پشتی یەك لە کەرەکان بوو، لە پاشان کەرەکانی ژمارد، بینی پێنج ماون، دابەزی و لە پشت کەری شەشەم ڕۆیشت، ئاوڕی بۆ پشتەوە دایەوە، هیچی نەدیت، هاتەوە پێش کەری شەشەم و دیسان کەرەکانی ژمارد، بینی هەر پێنجن، چووەوە پشت کەری شەشەم ئەمجارە ژماردنیەوە بینی شەشن، بەمە دڵخۆش بوو و دیسانەوە سواری کەرێکیان بووەوە.

ئەمجارەش پاش کەمێکی تر کەرەکانی ژماردنەوە، دیسانەوە بینی پێنج کەرن، بۆیە بە پەرۆشەوە هەر دەیژماردن و دەیژماردنەوە، هەر پێنج دەردەچوون، ئا لەو کاتەدا کەوتە بەرچاوی برادەرێکی، پێی گوت: چییە ئەوە مەلا؟!

مەلا مەشوور گوتی: لە ماڵەوە دەرچووم شەش کەرم پێ بوون، پاش ماوەیەك بوونە پێنج، دوای کەمێك بوونەوە شەش، ئێستا تەماشا دەکەم، دیسانەوە بوونەتەوە پێنج!!! ئەها تەماشایان بکە: ئەوە یەك، دوو، سێ، چوار، پێنج.. ئەدی کوا ئەوی تر چی بەسەر هات؟!!

برادەرەکەی پێی گوت: مەلا ئاخر ئەتۆ لەسەر شەشەمیانی، لەبیرت کردووە ئەوەی ژێرە خۆت بژمێری)!!!..[٣٧]

## هونەری یازدەهەم: ئەو گاڵتەیەی مەبەست لێی ڕاستییە

لە عەرەبدا (الهزل الذي يراد به الجد)ی پێدەگوترێت: ((بریتییە لە داڕشتنی دێڕێك، یان چەند دێڕێکی هۆنراوە لە بەرگی گاڵەو گەپدا، بەڵام لە

ناواخندا مەبەست ڕاستی بێ، نەك گاڵتە))[٣٨]، واتە: بریتییە لەو نیازە دڵەی، کە شاعیر یان نووسەر بە شێوەی گاڵتە ئاراستەی دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا مەبەستیشی لە قسەکانی واتا ڕاستەقینەکەیە، نەك گاڵتەکە. بۆ نموونە: لە چیرۆکی ئەو (خدر)ەی کە ژمارەی کەرەکانی لێ تێك دەچێت و هاوار دەکاتە کێخوای دێ، بەڵکو لەو ناڕەحەتییە دەربازی بکات، ئەویش کە دەپرسێت: بۆ چەند کەرت پێ بوو؟! ئێستا چەندت ماوە؟! ئەویش وەڵامی دەداتەوە، بۆی دەردەکەوێت، کە ئەو (خدر)ە کەرە، چوار کەری لە پێشەو خۆیشی سواری یەکێکیان بووە، ئەوە پێنج کەرەکە، یانی ئەو هەموو دڵەڕاوکێ و خۆ شڵەژاندنەی دەوێت؟! ئەدی ئەو فەقیرحاڵییە ئەگەر کەرێتی نەبێت؟! چییە؟! بۆیە کەرەکانی بۆ دەژمێرێت و دەڵێت: دە وەرە ئەوە پێنج کەرەکانت تەواو و ئەوەش کەری شەشەم زیاد، کە خۆتی!!

دیارە ئەو ڕستەیەی دوایی لە قاڵبی گاڵتەکردن بە (خدر) دەڵێت، بەڵام بە پێکەنین و لێی بزر دەکات، کە مەبەستی ڕاستی بێت، وای پیشان دەدات مەبەستی گاڵتەکردنە، بەڵام لە ڕاستیشدا مەبەستی تەواوی درکاندووە، نەك گاڵتەی کردبێت.. ئەوەتا شاعیر دەگێڕێتەوە دەڵێت:

**- بانگی کرد: کێخوا لە دەورت گەڕێم**

**لە کوێ خوا وا تۆی هێنایە سەر ڕێم**

**ئـــەمڕۆ جنۆکە گاڵـــەم پێ دەکـەن**

**جـــارێ کـــەرێکم ئەدزن و ئەیبـــەن**

**وتی: خدرئاغا چەند کەرت پێ بوو؟**

**چەندەیان ماون و چەندت لە کیس چوو**

**وتـــــی: پێنج کـــەرم هێنابوو لە شار**

**کــە ئەیژمێرم هــــاتۆتە سەر چوار**

**کێخوا تێگەیشت، کە گونی و گێزەر**

**لێك نــاکاتەوە کابرای قوڕ بە ســەر**

**ئەو کەرەی کەوا خۆی سـواری بووە**

**چونــکە نــایبینێ لــە بیری چـــووە**

**وتــــی: دابەزە هەی بەندەی بێغەش**

**پێنجی بۆ ژمارد خۆشی کرد بە شەش! !...** لا ٣٩١.

سوودی ئەم هونەرە ئەوەیە، شاعیر یان نووسەر قسەی خۆی دەکات و لێیشی بەرپرس نابێت، چونکە وەکو گاڵتە خستوویەتییە ڕووو زەینی قسە بۆکراوی لەوە کورت کردۆتەوە، کە ئەوەی دەیلێت بۆ خۆشی و گاڵتەیە، ئەگەرچی مەبەستی دڵی خۆیشی تەواو گوتووە، کە ئەمە خاوەنەکەی لەسەر ئێشەی زۆر دەرباز دەکات و لەولاوە زۆرجار قسە بۆکراویش حاڵی دەبێت، کە مەبەستی قسەکەر ڕاستییە، نەك گاڵتەو بەوە دێتەوە خۆ، لە قسەکەریش تووڕە نابێت، چونکە بە ڕاستەوڕاستی نەیشکاندۆتەوە، بەڵکو بە پێکەنین و خۆشی و مانەوەی ڕێزی لە بۆی، گوتەکەی خۆی پێشکەش کردووە.

## هونەری دوازدەهەم: کۆکردنەوە

لە عەرەبیدا (الجمع)ی پێدەگوترێت.. ((بریتییە لە کۆکردنەوەی دوو شت یان زیاتر لەژێر یەك حوکمدا))[٣٩]، بۆ نموونە:

**- ئێمە مایەی چوار سروشتین: ئاو و ئاگر خاك و با**

**ئەم هەوێنە کامی زیاتر بێ، بەلای ئەویا ئەبا...** لا ٢٩٠.

(ئاو و ئاگر و خاك و با) چوار شتن، لەوەدا کۆکراونەتەوە، کە چوار سروشتن.

**- ئەمین زەکی بەگ، صالّح زەکی بەگ**

**ئەم دوو زیرەکە دوو شوعلەن یەك یەك...** لا ٣٠٥.

لەم دێڕەدا (ئەمین زەکی بەگ) و (صالح زەکی بەگ) لەژێر بڕیاری (شوعلە)بووندا کۆکراونەتەوە.

**- حرصی ماڵداری و دووپشکی عەربەت**

**بۆ ئەهلی مەعنا بووە بە عیبرەت...** لا ٢٩٥.

لەم دێڕەدا (حرصی ماڵداری) و (دووپشکی عەربەت) دوو شتن لەژێر واژەی (عیبرەت)دا کۆ کراونەتەوە.

**- وا بە کوڵ ئەگریم لەگەڵ تۆ هەوری سووری بەهمەنی**

**من بەوەی گوڵ کەوتە ژێر گڵ، تۆ بەوەی گوڵ پێکەنی...** لا ٣٠٦.

لەم دێڕەدا لە نیوەدێڕی یەکەم (من) و (تۆ) لەژێر حوکم و سیفەتی (بە کوڵ گریان) کۆکراونەتەوە.

## هونەری سێزدەهەم: دابەشکردن

لە عەرەبیدا (التقسیم)ی پێدەگوترێت: ((بریتییە لە باسکردنی چەند شتێك، دواتر بە دیاریکردن بۆ هەریەکەیان شتێك زیاد بکرێت))[٤٠]، بۆ نموونە:

**ـ به جووت پەروانەو و ماسی، کە دڵدادەی چراو گۆلن**

**نزیکی ئەم ئەسووتێنیٚ، لە دووریی ئاو ئەوان حۆلن...** لا ٧٣.

لە نیوەدێڕی یەکەم باس لە (پەروانە) و (ماسی) کراوە، کە یەکەمیان حەزی بە (چرا)و دووەمیان حەزی بە (گۆل)ە، دواتر بۆ یەکەمیان ئەوە زیادکراوە، کە ئەگەر لە (چرا)کە زۆر نزیك بێتەوە دەسووتێت، بۆ دووەمیش کە (ماسی)یە ئەوە زیاد کراوە، کە ئەگەر لە (گۆل) دوور بێت (حۆل) دەبێت.

## هونەری چواردەهەم: لێککردنەوە

لە عەرەبیدا (التفریق)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە (ئاشکراکردنی جیاوازی نێوان دوو شت، کە لە یەك جۆر بن)).[٤١]، بۆ نموونە:

**ـ ئەم قەومی کوردە زۆر گەورەی بووە**

**بەڵام هەر یەکەی بۆ لایەك چووە**

**نادر و کەریم خان کەوتوونە ئێران**

**عەزیزی میسرە سەلاحەدینمان...** لا ٣٠٨.

لەم دوو دێڕەدا شاعیر باس لە کەسایەتییە گەورەکانی گەلی کورد دەکات، لە پاشان سیٚ لەو گەورانە لە یەکتر جیا دەکاتەوە، بەوەی کەوا دووانیان، کە (نادر و کەریم خان)ن کەوتوونەتە ئێران و (سەلاحەدین)یشمان کەوتۆتە میسرو بووەتە عەزیزی ئەویٚ.

**ـ ئەوەی نێر پیاوە منی لا سووکە**

**ئەوی ئەیەوێم ڕاست نێرەمووکە...** لا ٢٩٧.

نێرپیاو و نێرەمووك هەردووكیان ئادەمیزادن، بەڵام یەكەمیان لەبەر ئەوەی خۆی بەهێزە ئەو بە سووك دەزانێت و دووەمیان لەبەر ئەوەی نێرەمووكە بۆیە ئەوی دەوێت.

## هونەری پازدەهەم: كۆكردنەوە لەگەڵ دابەشكردن

لە عەرەبیدا (الجمع مع التقسیم)ی پێدەگوترێت: ((بریتییە لەوەی چەند شتێك لەژێر حوكمێك كۆ بكرێنەوە، دواتر دابەشیان بكەی))[٤٢]، بۆ نموونە:

**ـ ئەمین زەكی بەگ، صاڵح زەكی بەگ**
**ئەم دوو زیرەكە دوو شوعلەن یەك یەك**
**ئەمین زەكی بەگ پێشكەوت ئەمڕۆ دێ**
**صاڵح زەكی بەگ دوای ئەو ئەكەوێ...** لا ٣٠٥.

لەم دوو دێڕەدا سەرەتا (ئەمین زەكی بەگ) و (صاڵح زەكی بەگ) لە ژێر حوكمی یەك شوعلەییدا كۆكراونەتەوە، دواتر لە دێڕی دووەم بۆ هەر یەكەیان بە جیاو بە دەستنیشانكردن شتێ: زیاد كراوە، (پێشكەوت) بۆ (ئەمین زەكی) و (دوای ئەو ئەكەوێ) بۆ (صالح زەكی). ئەمەش (كۆكردنەوە لەگەڵ دابەشكردن)ی پێدەگوترێت.

**ـ دانیشتبووین لەگەڵ یار**
**من سەرمەست و ئەو هۆشیار...** لا ٣٥٨.

لەم دێڕەدا لە نیوەدێڕی یەکەم (ین)ی ڕاناوی کەسی یەکەمی کۆ، کە بۆ شاعیر دەگەڕێتەوە، لەگەڵ (یار)دا لەژێر حوکمی (دانیشتن)دا کۆکراونەتەوە، لە پاشان لە نیوە دێڕی دووەم، بە شێوەیەکی ئاشکرا (سەرمەست) بۆ شاعیر و (هۆشیار) بۆ یار دابەش کراون. ئەمەش (کۆکردنەوە لەگەڵ دابەشکردن)ی پێدەگوترێت.

**ـ ئێمە مایەی چوار سروشتین: ئاو و ئاگر خاك و با**

**ئەم هەوێنە کامی زیاتر بێ، بەلای ئەویا ئەبا**

**خاك و ئاو دایکن لەسەرخۆن، هێمن و ڕوونی ئەدەن**

**ئاگر و با زۆر خراپن، خیلقەتی پیاو تێك ئەدەن...** ل ٢٩٠.

لە دێڕی یەکەمدا لە ژێر واژەی چوار سروشتدا (ئاو و ئاگر خاك و با) کۆکراونەتەوە، لە پاشان لە دێڕی دووەم، سیفەتی دایکێتی بە (خاك و ئاو) و سیفەتی زۆر خراپی بۆ (ئاگر و با) دابەش کراوە.

## هونەری شازدەهەم: تێلنیشان

لە عەرەبیدا (التلمیح)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لەوەی هۆنەر بە شێوەیەکی خێراو بەبێ لەسەر وەستان، لە ڕێگەی وشەیەك، یان واتایەك، ئاماژە بۆ ئایەتێکی قورئانی پیرۆز، یان فەرموودەیەکی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خوای لەسەر)، یان داستان و حەکایەت و ئەفسانەیەك، یان کەسایەتییەکی ناسراو، یان ڕووداوێکی مێژوویی، یان پەندێکی پێشینان و...هەر شتێکی دیکەی هاوشێوە بکات.. بۆ نموونە:

**ـ الحمد ئەخوێنم ڕوو لە تۆ ئەکەم**

**به غائیبانه حەمدت بۆ ئەکەم...** لا ٣٦٧.

(الحمد) تێلنیشانه بۆ ئایەتی پیرۆزی ﴿الحمد لله رب العالمین﴾ی سەرەتای سورەتی (الفاتحة).

**ـ که گەیمه ئەوەی بڵێم (ایاك)**

**به نەشئەی حزوور دڵم ڕووناکه...** لا ٣٦٧.

(ایاك) تێلنیشانه بۆ ئایەتی پیرۆزی ﴿ایاك نعبد وأیاك نستعین﴾ی سورەتی (الفاتحة)یه.

**ـ پێغەمبەرەکەی خۆشەویستی خوا**

**خاتەمی نەبیت نەهاتووه له دوا...** لا ٣٧٩.

(خاتەم) تێلنیشانه بۆ ئایەتی پیرۆزی: ﴿ما کان محمد ابا احد من رجالکم ولکن رسول الله وخاتم النبیین وکان الله بکل شيء علیما﴾..

**ـ که مەرگ ئەو بەرگەی لیٚ ئەکاتەوه**

**تاتەشۆر لەشی پاك ئەکاتەوه...** لا ٣٨٦.

(تاتەشۆر) ئەو تەختەیه، یا ئەو بەرده پانەیه، که مردووی لەسەر ئەشۆن، پیرەمێرد ئەڵیٚ: هەندیٚ کەس به شێوەو دیمەن جل و بەرگیان پاکه، بەڵام به دڵ و به لەش پیسن، مەگەر که مردن و خرانه سەر تاتەشۆر جلەکانیان داکەندرا ئەوسا دەرئەکەون..لا ٣٨٦.

**ـ دڵ له (طور)ی بەدەنا ویستی به ناڵەی (أرنی)**

**وەکو موسا به تەمەننای نەبوو دەستورم...** لا ٣٨٣.

وشەكانی (طور) و (أرنی) تێلنیشانن بۆ سەربردەی ڕاستەقینەی قورئانی پیرۆز، كە تیایدا هاتووە: حەزرەتی موسا (دروود و سڵاوی خوای لەسەر)، كە لە كێوی (طور) موناجاتی لەگەڵ خودای گەورە كرد و داوای كردوە: ﴿أرني...﴾

**- هانام بە تۆیە خوای (ژیان) و (ژین)**

**لەم دەرفەتەدا شپرزە نەبین...** لا ١٠٩.

لەم دێڕەدا شاعیر بە وشەكانی (ژیان) و (ژین) تێلنیشانی بۆ ئەو دوو ڕۆژنامەیەی (ژیان) و (ژین) كردووە، كە خۆی دەری كردوون.

**- هاتمە بێستوون لای قەسری شیرین**

**بۆ فەرهاد گریام بە دڵەی نمین...** لا ١١٥.

فەرهاد و بێستوون تێلنیشانن بۆ داستانی شیرین و فەرهاد و بەسەرهاتی تراژیدی فەرهاد و هەڵكۆڵینی ئەو كێوە، كە كێوی تاشیوەو تابلۆی لێ دروست كردووە.

## هونەری هەڤدەهەم: تێلنیگا

لە عەرەبیدا (الألتفات)ی پێدەگوترێت.. پۆلص عەواد دەڵێت: ((ئەوەیە كە قسەكەر لە قسەكردنەكەیدا لە یەكێ لەم سییانە (غائیب - گوێگر - قسەكەر) بڕوات بۆ ئەوی تر))[٤٣]، بۆ نموونە:

**- كوڕگەل بە گاڵتە بڵێن بە دوژمن**

**کەوتن بۆ ئەوەو سەرکەوتن بۆ من...** لا ١٠٦.

لەم دێڕەدا (کورگەل) گوێگرە، (دوژمن) کەسی غائیبە، (من) قسەکەرە، قسەکردنەکەی شاعیر لێرەدا هەر بۆ گوێگر نییە، بەڵکو بۆ گەیاندنی هەواڵێکە بە کەسی غائیب.

## هونەری هەژدەهەم: ڕووتەوەکردن

لە عەرەبیدا (التجرید)ی پێدەگوترێت.. ((زیاتر لە شێوەیەکی هەیە، بەڵام لە ئەدەبی کوردیماندا بڵاوترین شێوەکانی ئەوەیە، کە شاعیر لە هۆنراوەکەی ڕووی دەمی لە خۆی بکات و لەگەڵ خۆی بدوێت))[٤٤]، بۆ نموونە:

**ـ دڵە بـا بەس بێ، دڵە بـا بەس بێ**

**وەرەوە هۆش خۆت، دڵە با بەس بێ**

**جڵەوت با بەس بە دەس هەوەس بێ**

**بـــە گڕی سەودا دڵت قەقنــەس بێ**

**بـــا بەس خەیاڵت خەیــاڵی خاڵ بێ**

**بە پیری عەقڵت وڕکی منداڵ بێ! !...** لا ٢٤٤.

لەم چەند دێڕە دیارە شاعیر ڕووی دەمی کردۆتە خۆی و ئامۆژگاری خۆی دەکات، کە لەمەولا چی بکات و چ هەڵوێستێك بگرێتە بەر، وەکو ئاشکرا داواکارییەکانی دیارە.

## ئەنجام

١- بە شێوەیەکی گشتی لێکۆڵینەوەکانی بواری ڕەوانبێژی لای کورد هێشتا لە قۆناغی سەرەتان.

٢- (٢٦) هونەری جوانکاری لە شیعرەکانی پیرەمێرد بەدی کراون، هەشتیان لە جۆری جوانکاری وشەیی و پازدەیان لە جۆری جوانکاری واتایی.

٣- هەریەکە لەو هونەرانە نموونەی زۆر و جۆراو جۆری دۆزراونەتەوە لە شیعرەکانی پیرەمێرد.

٤- بوونی ئەو هەموو هونەرو جۆرە زۆرانەی هەر یەکێك لە هونەرەکان لای ئەو شاعیرە، هۆیەکی گرنگ و یارمەتیدەرن بۆ ناسك و جوان و بە کاریگەری دەرکەوتن و مانەوەی شیعرەکانی.

٥- هەموو ئەو ئەنجامانە ئەوە دەردەخەن، کە شیعرەکانی پیرەمێرد ئەو توانایەیان تێدا بێت، بۆ نامەیەکی ماستەر، یان دکتۆراش بشێن، کە تایبەت بێت بە ڕەوانبێژی لە شیعرەکانی.

## پەراوێزەکان

١ـ يوسف ابو العدوس، البلاغة والأسلوبية، الطبعة العربية الأولى، الأهلية للطباعة والنشر، عمان، ١٩٩٩، ص ١٢٩.

٢ـ ابن منظور، لسان العرب، الجزء الثامن، بيروت، ١٩٦٨، ص ٦.

٣ـ سەرچاوەی پێشوو، لا ٧.

٤ـ صحيح مسلم، الرقم: ١٤٣٥.. سنن الدارمي، الرقم: ٢٠٨.. مسند الأمام احمد، الرقم: ١٦٥٢٢.

٥ـ بڕوانە: هەژار، هەمبانە بۆرینە، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، ١٣٦٨ی هەتاوی، لا ١٨٥.

٦ـ ئیدریس عەبدوڵڵا، جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، لا ٩.

٧ـ البلاغة والأسلوبية، ص ١٢٩.

٨ـ سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو.

٩ـ سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو.

١٠ـ سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو

١١ـ عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٤٢٣ ی کۆچی ـ ٢٠٠٢ ز، لا ٧٦و٧٧.

١٢ـ البلاغة والأسلوبية، ص ١٣٢.

١٣ـ عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی، لا ٧٧.

١٤ـ جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا، لا ٣١.

١٥ـ سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٢.

١٦ـ البلاغة والأسلوبية، ص ١٥٠.

١٧ـ البلاغة والأسلوبية، ص ١٥٠.

١٨ـ بڕوانه: سعدالدين التفتازاني، شرح المختصر، الجزء الثاني، ايران، ص٢٠٠و٢٠١.

١٩ـ جوانكاری له ئەدەبی كوردیدا، لا ٤٧.

٢٠ـ عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی له ئەدەبی كوردیدا، بەشی دووەم: جوانكاری، چاپی یەكەم، هەولێر، ١٩٧٦، لا ٤١.

٢١ـ مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیس، بەدیع و عەرووزی نامی، چاپی یەكەم، بەغدا، ١٩٩١، لا ٥٤.

٢٢ـ جوانكاری له ئەدەبی كوردیدا، لا ٥٣.

٢٣ـ جوانكاری له ئەدەبی كوردیدا، لا ٤٣.

٢٤ـ عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی، لا ١٣٩.

٢٥ـ البلاغة والأسلوبية، ص ١٣٦.

٢٦ـ د. احمد مطلوب، البلاغة العربية، مطبعة جامعة الموصل، الموصل، ١٩٨٠، ص ٢٩٥.

٢٧ـ سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو.

٢٨ـ محمود البستاني، القواعد البلاغية، ط ١، طبع ايران، دون سنة الطبع.ص ٢١٨.

٢٩ـ ڕەوانبێژی له ئەدەبی كوردیدا، جوانكاری، لا ٨٠.

٣٠ـ جوانكاری له ئەدەبی كوردیدا، لا ١٠٨.

٣١ـ ڕەوانبێژی له ئەدەبی كوردیدا، جوانكاری، لا ٨٣.

٣٢ـ تفتازانی، شرح المختصر، ٢، ٢١٢.

٣٣ـ سەرچاوەی پێشوو، لا ١٤٣.

٣٤- بەدیع و عەرووزی نامی، لا ١٣.

٣٥- الخطيب القزويني، الأيضاح في علوم البلاغة، طبعة ايران، دون سنة الطبع، ص ١٩٧.

٣٦- بەدیع و عەرووزی نامی، لا ٦٣.

٣٧- سعيد قانعي، نوادر جحا الايراني، ترجمة: يوسف عبدالفتاح فرج، القاهرة، المجلس الأعلى للثقافة، ٢٠٠٣، ص ٣٥.

٣٨- جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا، لا ١٢١.

٣٩- تفتازاني، شرح المختصر، ٢، ص ١٥٦.

٤٠- سەرچاوەی پێشوو، ٢، ١٥٧.

٤١- عەبدولسەلام سالار عەبدولڕەحمان، هونەری ڕەوانبێژی لە شیعری (نالی)دا، نامەی ماستەری پێشکەشکراو بە کۆلێژی زمانی زانکۆی سلێمانی، شەوال ١٤٢٠ هیجری، کانوونی دووەمی ٢٠٠٠، لا ١٩٣.

٤٢- تفتازاني، شرح المختصر، ٢، ص ١٥٨.

٤٣- عەبدولسەلام سالار عەبدولڕەحمان، هونەری ڕەوانبێژی لە شیعری (نالی)دا، لا ١٩٤.

٤٤- جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا، لا ١٣٠.

## سەرچاوەکان


**یەکەم: کتێب بە زمانی کوردی**

١ـ ئیدریس عەبدوڵڵا، جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.

٢ـ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، بەدیع و عەرووزی نامی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٩١.

٣ـ عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەشی دووەم: جوانکاری، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٧٦.

٤ـ عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٤٢٣ی کۆچی ـ ٢٠٠٢ ز.

٥ـ محەمەد ڕەسول هاوار، دیوانی پیرەمێرد، چاپی ئێران لەسەر چاپی ساڵی ١٩٦٨ی بەغدا، بەبێ ساڵی چاپ.

٦ـ هەژار، هەمبانە بۆرینە، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، ١٣٦٨ی هەتاوی.

**دووەم: نامەی زانکۆیی بە زمانی کوردی**

٧ـ عەبدولسەلام سالار عەبدولڕەحمان، هونەری ڕەوانبێژی لە شیعری (نالی)دا، نامەی ماستەری پێشکەشکراو بە کۆلێژی زمانی زانکۆی سلێمانی، شەوال ١٤٢٠ هیجری، کانوونی دووەمی ٢٠٠٠.

**سێیەم: کتێبەکانی فەرموودە**

٨ـ صحيح مسلم، الرقم: ١٤٣٥.

٩ـ سنن الدارمي، الرقم: ٢٠٨.

١٠ـ مسند الأمام احمد، الرقم: ١٦٥٢٢.

**چوارەم کتێب بە زمانی عەرەبی**

١١ـ ابن منظور، لسان العرب، الجزء الثامن، بيروت، ١٩٦٨.

١٢ـ د. احمد مطلوب، البلاغة العربية، مطبعة جامعة الموصل، الموصل، ١٩٨٠.

١٣ـ سعدالدين التفتازاني، شرح المختصر، الجزء الثاني، ايران، دون سنة الطبع.

١٤ـ سعيد قانعي، نوادر جحا الايراني، ترجمة: يوسف عبدالفتاح فرج، القاهرة، المجلس الأعلى للثقافة، ٢٠٠٣.

١٥ـ الخطيب القزويني، الأيضاح في علوم البلاغة، طبعة ايران، دون سنة الطبع.

١٦ـ محمود البستاني، القواعد البلاغية، ط ١، طبعة ايران، دون سنة الطبع.

١٧ـ يوسف ابو العدوس، البلاغة والأسلوبية، الطبعة العربية الأولى، الأهلية للطباعة والنشر، عمان، ١٩٩٩.

# ملخص البحث

## (بعض فنون البديع في شعر پيره‌ميرد)

**ادريس عبدالله مصطفى**

ان هذا البحث الموسوم بـ(بعض فنون البديع في شعر پيره‌ميرد) دراسة بلاغية نقدية، تعد بمثابة محاولة لتحديد القدرة الأبداعية لدى الشاعر الذي نهض بتوظيف الفنون البديعية في اشعاره، ليفضي على شعره مزيدا من التأثير والجمال، وقد تمخض من البحث نتائج عدة، نوجزها في النقاط التالية:

١ـ ان الدراسات البلاغية الكردية لا تزال في طورها البدائي، ولا توجد لحد الآن دراسة جامعة كاملة تجمع تحت ثناياها المزيد من الفنون التي لم تأت ذكرها بعد عند بلاغيين الكرد.

٢ـ هناك اعمال ومحاولات ورسائل الدراسات العليا في مجال البلاغة الكردية، ولكن لا تزال المكتبة الكردية بحاجة لمزيد من الدراسات في هذا المجال.

٣ـ كان (پيره‌ميرد) شاعرا امسك ناصية فنون البديع، وكتب اشعاره بصورة بديعة رائعة، بحيث لا يكاد يخلو بيت من ابياته من احدى فنون البديع.

٤ـ تمكن الشاعر من تجسيد ٢٦ فنا من فنون البديع في اشعاره، ثمانية فن من (المحسنات اللفظية) وهي: (الجناس)، (الأقتباس)، (التضمين)، (رد العجز عن الصدر)، (الترديد)، (التكرار)، (التشطير)، (لزوم ما يلزم). وتجسد ثمانية عشر فنا من (المحسنات المعنوية) وهي: (الطباق)، (المقابلة)، (اللف والنشر)، (حسن التعليل)، (المذهب الكلامي)، (التورية)، (العكس)، (الأرصاد)، (تشابه الأطراف)، (العقد)، (الهزل الذي يراد به الجد)، (الجمع)، (التقسيم)، (التفريق)، (الجمع مع التقسيم)، (التلميح)، (الألتفات)، (التجريد).

٥ـ وجود كل تلك الفنون البديعية في اشعار (پيره‌ميرد) اضفى جمالية تعبيرية في شعره.

## Abstract

## Piramerd's Poetry and the art of figures of Speech

Idris Abdullah Mustafa

The study is a rhetorical and critical essay that reveals the poet's creative ability in investing figures of speech (imagery, metaphor, simile, metonomy, allegory and personification) within his poetry to add a touch of beauty and impression. The study concluded with the following points:

Kurdish rhetoric study is still in its preliminary status without a concluded complete study that brings together all the arts of figures of speech, not mentioned by Kurdish scholars in this field.

Though there are some studies, theses and essays on Kurdish rhetoric, but Kurdish library is still in need of further.

Piramerd, as a poet, is held in high regard by extreme and impressive use of rhetoric all round every verse.

The poet was able to embody his verses with (26) kinds of arts of figures of speech, such as paronomasia, quotation and implication… etc.

The wide variety of the art of figures of speech used by Piramerd are the expressive of the poets genius.

# تایپۆلۆجیای زمانی کوردی

**د. وریا عومەر ئەمین**

**هەزاران زمان لەسەر رووی ئەم زەمینە هەیە . هەندێ لەم زمانانە لێك دەکەن و هەندێ جیاوازن . هەر لە کۆنەوە زمانەوانان بیریان لە لێکچوون و جیاوازیی نێوان زمانان کردووە .**

زمانەوانی ئەڵەمانی ویلهێلم ڤۆن هەمبۆڵدت (١٧٦٧ ــ ١٨٣٥) زمانانی جیهانی دابەش کردە سەر سێ تایپ ( جۆر) بە پێی سرۆشتنی دارشتنی وشەکانیان. بەمە رێبازی پۆلکردنی تایپۆلۆجی لە زمانەوانییا سەری هەڵدا. زمانەکان دەشێ لە هەموو ئاستەکاندا بەراورد بکرێن. یەکێ لەم ئاستانە (مۆرفۆلۆجیا)یە. مۆرفۆلۆجیا لە یاساکانی دارشتنی وشە لە زمانا دەکۆڵێتەوە.

مۆرفیم کەرەسەی خاوی دارشتنی وشەیە ، بچووکترین دانەی واتاداری زمانە رۆڵێکی لە رێزمانا دەخرێتە پاڵ ، لە فۆنیمێ یا زیاتر پێك دێت. بۆ نموونە رستەی :

**بەرخە جوانەکە ئاو دەخواتەوە**

لەم چوار وشەیە پێك هاتووە ( بەرخە — جوانەکە— ئاو — دەخواتەوە)

**وشەی یەکەم ( بەرخە) لەم مۆرفیمانە پێکهاتووە:**

١ـ (بەرخ) یەك مۆرفیمە، لە چوار فۆنیم پێك هاتووە. یەك واتای هەیە

٢ـ (ـە) مۆرفیمێکە لە یەك فۆنیم پێك هاتووە، دەوری لە رێزمانی کوردی یا لێکدانی ناو و ئاوەڵناوە کەر ناوەکە ئامرازی پێناسینی لە گەڵا دەرکەوت.

**وشەی دووەم ( جوانەکە) لەم دوو مۆڕفیمە پێکهاتووە:**

١ ـ (جوان) لە چوار فۆنیم پێك هاتووە و واتایێك دەبەخشێ .

٢ ـ (ەکە) لە سێ فۆنیم پێك هاتووە ، ئامرازی پێناسینە.

**وشەی سێ یەم ( ئاو ) لە یەك مۆڕفیم پێکهاتووە:** لە دوو فۆنیم (a:w) پێکهاتووە.

**وشەی چوارەم ( دەخواتەوە)**

١ ـ (دە) لە دوو فۆنیم پێکهاتووە، ئامرازی بەردەوامییە.

٢ ـ (خۆ) لە دوو فۆنیم پێکهاتووە، رەگی کاتی ئیستای داهاتووی (خواردن) ـە.

٣ـ (ات) لە دوو فۆنیم پێکهاتووە. راناوی رێکەوتنە، کەسی سێیەمی تاك (ئەو) دەگەیێنێ.

٤ ـ (ەوە) لە سێ فۆنیم پێکهاتووە. مۆڕفیمێکی وشە دارێژە.

وشەکانی زمان لە رووی پێکهاتنی مۆڕفۆلۆجییەوە و پەیوەندیی مۆڕفیمەکان بە یەکتر لەناو چوارچێوەی وشەدا سێ جۆرن.

**یەکەم** — ئەو وشانەی لە زیاتر لە مۆڕفیمێك پێك دێن، مۆڕفیمەکانی بەرێز پێکەوە دەلکێن و قالبی هەر یەکەیان بە ئاسانی دەستنیشان دەکرێت و لێك جیا دەکرێنەوە ، وەك:

نەمامەکەتم / نەمام ـ ەکە ـ ت ـ م

دابڕینەوە / دا ـ بڕ ـ یـ ـ ن ـ ەوە

**دووەم** ـ ئەو وشانەی لە زیاتر لە مۆڕفیمێك پێك دێن و مۆڕفیمەکانی لەناو یەکتردا تواونەتەوە و قالبەکانیان دەستنیشان ناکرێن و لێك جیا ناکرێنەوە. وەك وشەی ( هات) کە لەم سێ مۆڕفیمە پێك هاتووە:

١ ـ رەگی داهاتووی لە (هاتن) وەرگیراو.

٢ ـ مۆرفیمی نیشانەی کاتی رابردوو.

٣ ـ راناوی کەسی سێیەمی تاکی بەرامبەر (ئەو).

هەرگیز قاڵبی ئەم مۆرفیمانە لە ناو ئەم وشەیە دەست نیشان ناکرێن بەپێچەوانەی وشەی (هێنای) کە لەم مۆرفیمانە پێك دێت :

١ ـ (هێن) ( رەگی کاتی داهووتووی لە چاوگی ـ هێنان ـ ەوە وەرگیرا.

٢ ـ (ا) مۆرفیمی کاتی رابردوو.

٣ ـ (ی) راناتوی لکاوی کەسی سێیەمی تاك (ئەو).

**سێیەم ــ** ئەو وشانەی لە تاکە مۆرفیمێك پێك دێت و هەرگیز رێگە نادەن هیچ مۆرفیمێکی تریان پێوە بلکێ وەك ( بۆ ــ تا ــ بەلاَم )

لە هەموو زمانێکا هەرسێ جۆر دارِشتن بەرچاو دەکەوێ ئەوەندەیە رێژەی جۆرێکیان لەوانی تر پترتر دەبێ رێژەی جۆرێکی تر بە پلەی دەەوم دێ ئەویتریان پە پلەی سێیەم.

زمانەوانی ئەڵەمانی ویلهێلم ڤۆن هەمبۆڵدت (١٧٢٦ ــ ١٨٣٥) زمانانی جیهانی دابەش کردە سەر سێ جۆر بە پێی سرۆشتنی پێکهاتنی مۆرفیمی وشەکانی.

١ـ ئەو زمانانەی زۆربەی وشەکانیان لە جۆری یەکەمە ناونرا agglutinative ( نووساو ). وەك یابانی و تورکی و سواهیلی

٢ـ ئەو زمانانەی زۆربەی وشەکانیان لە جۆری دووەمە ناونرا Fusionalیا Inflecting ( تواوە ) لاتینی و یۆنانی

٣ـ ئەو زمانانەی زۆربەی وشەکانیان لە جۆری سێیەمە ناونرا Isolating یا analytic(دوورەپەرێز). وەك چینی و بورمی

دوایێ و لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و بەراورد کرنی ژمارەیێکی زۆر لە زمانانی جیهان بە پێی ئەم بنەمایە لە بواری بەراوردیی Typology دا، دوو جۆری تر دەستنیشان کران کە ئەمانەن:

٤ـ زمانی Incorporating یا Polysenthetic (فرەمۆڕفیمدار): ئەمە تایپێکە لە agglutinative. ئەوەندەیە وشەی وای تیایا ژمارەی مۆڕفیمەکانی زۆرن و دەشێ رستەی تەواوی تیا لە قاڵبی وشەیەکدا دارێژرێ.

٥ـ زمانی ناوگری Infix لەم جۆرە زمانەدا مۆڕفیمەکان دچنە ناو یەك و ڕەگی یەکتر دەسمن. قاڵبی هەر یەکە لە مۆڕفیمەکان بە روونی دەستنیشان دەکرێ. زمانی عەرەبی لەم تایپەیە. بۆ نموونە رەگی ( ع ــ م ــ ل ــ ) ریزە بزوێنی وەك ( ــە ــ ــە ) تێهەڵکێشی بۆشایی یەکەم و دووەم بکرێ , دەبێتە ( عەمەل ) واتا (ئیش). ئەگەر ریزە بزوێنی ( ــە ــ ــە ــە) تێهەڵکێشی بۆشایی یەکەم و دووەم و سێیەم کرا دەبێتە (عمل ـ عەمەلە) واتا (کردی). ئەگەر ( ا ــ ی ) خرایە بۆشایی یەکەم و دووەم دەبێتە (عامل ـ عامیل) واتا (کرێکار) و ... بەم جۆرە دەیان ئیحتیمالی تر هەیە.

پە شیکردنەوەی زمانی کوردی لە ئاستی مۆڕفۆلۆجیدا لە ژێر تیشکی ئەم پێوانانەی سەرەوە دەرئەکەوێ کە کوردی زمانێکی پۆلۆسینسیتیکە بە تایبەتی لە وشە مۆڕفۆسینتاکسییەکاندا کە تیایاندا رستەیێکی تەواو لە قاڵبی تاکەوشەیەکدا دادەڕێژرێ. وەك لە (رامانەگرتبوویت ـ ئێمە تۆمان رانەگرتبوو). کە لەم نۆ مۆڕفیمانە پێکهاتووە ( را — م — ان — نە — گر — ت — ب — وو — یت ).

# سەرچاوەکان

Amin. W.O ( 1976 ) Some fundamental rules of Kurdish Syntax
Structure. London.
Amin. W. O (1979) Aspects of the verbal Construction in Kurdish. Thesis
presented to the University of London.
Bazel, C.E. (1958) Linguistics Typology. London.
Matthews, P. H. (1970) Morphology. Cambridg University press.
Robinsm R. H. (1971) General Linguistics – Longman. London.

وريا عمر أمين (١٩٨٦) مردنی وشه . گۆڤاری کاروان. ژماره ٤٥ ل٨ـ١٤. هەولێر.

# ملخص البحث

# التصنيف النمطى للغة الكردية

د. وريا عمر امين

يهدف التصنيف النمطي في علم اللغة الى تصنيف اللغات الى مجاميع على اسس اوجه التشابه فيما بينها في واحدة او اكثر من مستويات التحليل.

العالم اللغوي الالماني وليم فون همبولدت (١٧٦٨ – ١٨٣٥ ) هو اول من صنف لغات العالم الى ثلاث مجاميع وفقا لنمط علاقة الوحدات الدلالية ضمن بناء الكلمة. وهي:

١ – اللغات اللاصقة – تتكون كلماتها من عدة وحدات دلالية يمكن تحديد تركيب وحداتها الدلالية والفصل فيما بينها.

٢ – اللغات الذائبة – تتكون كلماتها من عدة وحدات دلالية لا يمكن تحديد تركيب وحداتها الدلالية والفصل فيما بينها.

٣ – اللغات العازلة – تتكون كل كلمة فيها من وحدة دلالية واحدة لا تسمح لاية وحدة دلالية اخرى بالالتصاق بها.

وأخيرا اضيف نمطان آخران وهما:

٤ – اللغات المخترقة .

٥ – اللغات المتسلسلة.

بدراسة اللغة الكردية على ضوء هذه الانماط تستنتج بأنها من اللغات المتسلسلة.

# Abstract

## The Typology of Kurdish Language

***Professor Dr. Waria Omar Amin***

Typological Linguistics is an attempt to classify the languages of the world into groups in terms of their similarities. It can operate at all Linguistic levels (Syntax – Morphology … etc).

First Typological classification was proposed by Wilhelm von Humboldt (1768 – 1835). He established three main groups of languages on word structure grounds.

1 – Agglutinative languages, in which words contain a linear sequence of morphemes, as in English, Turkish, Kurdish.

2 – Fusional languages (Inflectional), in which words typically contain more than one morpheme, but there is no one to one correspondence between these morphemes and their liner sequence the word contains, as in Sanskrit.

3 – Isolating languages, in which its words are invariable, as in Chinese and Southeast Asian languages. Recently two other types have been suggested which are:

4 – Infixing languages in which one affix is added within a root or stem, as in Arabic.

5 – Polysynthetic or (Incorporating) languages in which the words demonstrate morphologically complex and long word forms.

Analysis proves that Kurdish Language falls within polysynthetic type.

# Liser elfabeya latînî Kurdî

**Dr. Hussein Habasch**

Bi vê sernivîsê **"Be latînîzekirdin yan be kemalîzekirdinî elfbêy kurdî"** berêz Necatî Ebdulla benda xwe di hejmara yekê ya "kurdnasî" de, sala 2005-a ji "Navenda Havîbûn ya lêkolîn u weşanên kurdî li Berlinê derdikevît" belavdike. Ew bi xwe jî sernûserê wê çapemeniyê ye. Nivîsevan kina (riqdarî) xwe derdixe ji wan siyasiyên kurd re, ewên li Başûrê Kurdistanê pêşniyazdikin, ku pirtûkên kurdî bi latînî jî bêne çapkirin u dipirse**:"Aya pêwîste zimanî kurdî be elfbêy latînî binûsîn?; Aya dekirê zimanî kurdî be tîpî latînî binûsîn?; Em kare çend be qezencî zimanî kurdîye?** Necatî Ebdulla vê pirsiyara serekîn jî dike **"..bo çî waz le elfbêyek bihênîn bo xatirî elfbêyekî dike?".** (r.7) Ew weha diencimîne, ku nivîsîn bi latînî dibe barek ji zimanê kurdî re. Nivîsevan ji serkirdayetiya siyasî kurdî jî dipirse, ku destên kê hene lip aş wî karî?. Li dawiya pêşgotin xwe mamoste heq nade siyasiyên kurdan xwe bi wê pirsê ve mijûl bikin, jiberku ew pirseke zimanzaniyê ye, pirsa ekadêmiyên zanistî ye, ne karê siyasiyên kurd e w eger ew bi wî karî rabin, ew ligor raya N. Ebdulla

**“Serkirdayetî kurd le Kurdistanî Başûr yarî** (lîsk, leystin) **be agirêkî zor tirsinak dekat”.** (r.7). Di bin vê sernivîsa serekîn de **“Rojawazedegî: Hêlkeyekî pîsbû”** – wateya vê bêjehegirtinê ev e: Roj+awa (rojava)+zede (şerm)+gî (paşgir e), hêlke (hêk; hêlîn)- nivîsevan bi çend rêzan dabaşa ronakbîrên osmanî dike, ewên şeydayê (aşiqê) her tiştî bûn ji Rojava; yek ji wê şeydayê pirsa guhartina elfbeya local (navçeyê) bi ya latînî bû. “Seretayî seedy bîstem Mustefa Kemal bo nizîkbûnewe le Rojawa elfbêy zimanî yurkî gorrî”. (r.8) paşê nûser berdewandike **“Be daxewe be çawlêkerî kemalîzim kurekanî Bedirxan elfbêyekî latînîyan beser beşêkî zimanî kurdîda sepandin”** û bi tewjimî dibêje **“Le rastîda elfbêyî latînîyakey ewan** (Bedirxanyan H.H) **kopîyekî kalî elfbêy latînîyakey turkî bû”.** (r.8) Her mamosteyê berêz bi wê tenê nake, hîn hesreteke pir mazin jî dixwe ku prosêsa “rojawazedegîye” di dema **“Hacî Qadirî Koyîyewe hatote naw ronakbîranî kurd u êste xerîke bazarî germdabêtewe”.** (r.8) Tevî çewtiyên dîrokî wek “zimanzan” jî mamoste dixwaze “rayine nû” bibêje, ku elfabeya latînî nagunce di zimanê kurdî de, jiberku tîpin erebî di kurdî de hene w bi wê elfabeyê natên nivisîn. Bikaranîna elfabeya latînî ligor raya lêgervan pir arîşeyan (kêşe; problem) tîne pêş zimên u belgeha wî jî her nivîsa tîpên erebî di kurdî de, lema jî ew weha nîşandike **“Le rûy**

**zimanîyewe dîyardeyekî yekcar negative le naw zimanda''**. (r.10) Raya duhem ji nenivîsa kurdî bi latînî ligor dîtina nûserê berêz **“Pirseke kultûrî ye”** w bêjeya “dizêwbûn” (neşîrîn, neçar) dinivîse **“Min pêm waye dizêwbûnî elfbêyî latînî serbarey dizêbûne zimanewanîyekey dizêwbûne kulturîyekeyetî”ye.** (r.10)-maneya wê: Ez dibînim, ku neşîrîniya (neçarîya) elfabeya latînî ji aliyê zimanzaniyê de neşîrîniyeke kulturî ye jî.) - w berdewamdike, eger hinek dibêjin, ku elfabeya erebî ne ya kurda ye, ez jî dibêjim elfabeya latînî ji hezar carî zêdetir ne ya kurda ye. (binêre: r.10) Merem ji xala kultûrî ew e, ku kurdan jî di kultur u şaristaniya navçeyê de beşdarî kirine, çawa ereb, faris, efxanî, piştû w pakistaniyan, (ew gelên bi elfabeya erebî dinivîsin) ev miletina ji hev nîzîktir in, bêtir ji ewropiyekî şepqeliser. (bin.:r.10)

Lêkolvan ewan li dijî elfabeya latînî kurdî ye, her naxwaze wê jî binavîne w wê weha pêşberdike **“Renge yek le dawa zeqekanî** (zeq: beq, zeqey çaw: çavê beq) **hewadaranî** (bêjeyek pêncmanayî ye, li vir bi maneya evîndar; aşiq, alîgir tê) elfbêy turkî (kemalî) - mebesta wî elfabeya latînî celadetî ye H.H - **ewe bêt ke kurdî bakûr zorînen u boye debê ême waz le elfbêy kurdî bihênîn u neçarbîn bew latînîye binûsîn ke dagîrkerekanî ewan be ser ewanda sepanduwe”.** (r.11) - Wateya wê bi kurmanciya bakûrî: Belkî yek ji daxwazên berbiçav

yên alîgirên (aşiq; evîndar) elfabeya turkî (kemalî) ew be, ku kurdên bakyr piranî ne w her jiber wê yekê divê em dev ji elfabeya kurdî (ya erebî H.H) berdin u me neçarbikin bi wê latîniyê binivîsin; ewa dagîrkerên wan bi zorê bi ser wan de dane pejirandinê-. Dagîrkerên Bakur ne yên N. Ebdulla ne; ew xwe kurdekî kurdistanî najmêre, xwe kurdekî "local" dibîne. Dagîrkerên Kurdistanê tu caran elfabeya zanînê bo kurdan danenîne; wan tenê ji sedsalên borî de w ta niha elfabeya berberzim u giştkujiyê ji me re danîne. Lêkolvan hîn şîretan jî li kurdan dike, ku divê ew xwe ji tirkan dûrbixin u bi elfabeya erebî binivîsin (bin.: r.11) u çewtiya Mistefa Kemal dubare ne kin, çinkê wî tirk ji şaristaniya kultura osmanî bidûrxistine. (bin.: r.12) Her jiber wê yekê jî tirk bûye tiştekî ecêb; ne tirk, ne ewropî ye w ji osmantiyê hatiye birîn. (bin.: r.12) Li dawiya bende xwe ew bangî hevrayên xwe dike w ji wan re rewşa nalebar ya zimanê kurdî nîşandide, ku **"Zimanê kurdî le beramber hereşeyekî rasteqînedaye".** (r.12) W bila serkirdayetiya siyasî kurdî bi agir nelîze. (bin.:r.12) Raya dawî ya mamoste ew e, ku kurdî nikare bi latînî bê nivîsandin; latînîzekirina kurdî kurdan ji kultura xwe dibire w kurd ji kulturên herêmê têne bi dûrxistin. (bin.: r.12)

## Lêhûrbûn liser vê nivîsarê

Eger mera ji aliyê erênî de li vî karî temaşbike, tenê mera çirûskeke rastiyê tê de dibîne; ew jî elfabeya erebî kurdî ji yên din tekûztir e. Ji bilî wê ligor raya me tu erêniyên din tê de peydanabin. Me ne dixwast berêz Necatî Ebdulla xwe bêxe rewşeke weha dijwar, ne şayiste w ewna çewtiyên mezin bike, lema jî armance vê nivîsarê, hewldana serrastkirina wana ye.

Navnîşan bi şêwakî giştî naveroka her nivîsarekê, eger ew zanistî yan hunerî be, raber dike. Ev benda lijor navhatî bi navnîşana xwe mixabin pir hurhutandî ye (provoketîv), ew xuyadike, ku elfabeya latînî kurdî ciyok e (hevwate; hevmane) ji kemalîzmê re: **Ev raya jî derûn u dilê her kurdekî dilsoz birîndar dike. Bi nasût (karaktir) u strûktûra xwe ev kara ne objêktîv e; dûr e ji mêtodên zanistiyê; berhemeke bîrteng e (bîrtesk), entîkurd e.**

***Ji bo çî entîkurd e?***

Her kesekî kurdî bi tîpên latînî nivisîbe w dinivîse, wî xwe kirî w dike rajeya dijminan (zimanê me nagere, ku em bibêjin rajeya kemalîzê), eger wehabe; kî ji kurdan ma? Hemî berhemên nivîskarên biyanî yên hatine wergerandin u bi latînî çapbûne dikevin xaneya dijminan. Ne diviyabû karekî wean bihata çapkirin di nav rûpelên "Kurdnasî" yê de. **Ew**

**karekî pûblîstî twîj e, di her cûre masmêdyayên entîkurd de bi serbilindî kane cihê xwe bigire w** wê ne dûr be xwediyê wî kanibe xilata “Eteturk” jî wergire!!

***Kurdî bi latînî tê nivisîn yan na?***

Di dawiya salên sî de ji sedsaliya hefta ya zayînî gelê kurd u yên din neereb jî ketin ber êrişên erebên misilman, hêdî hêdî wan ew millet bi zora şûr neçarkirin, hînî ziman, ayîn u çanda wan bibin. Kesî ji wan miletan bi razemendiya xwe ew çand u elfabeya wan ne pejirand. Ew elfabeya ta niha jî li pişkine Kurdistanê deselatdar e. Li Iraqê piştî 11-ê adara 1970-ê w naskirina ewtonomiya Kurdistanê asoyine nû ji pêşdabirina çanda kurdî re vebûn, guhartinin di elfabeyê de jî hatin kirin, lê ta niha jî tîpa “i” tê de tine ye. **Divê ev rastiya jî bê dubare kirin, ku elfabeya erebî bi kotekî ji kurdan re bûye heyîn.**

Eger em minhoyên (têkst) kurdanasên ewropî yên bi elfabeya erebî komkirine u transkrîpsiyona (li vir nivisîna tîpên erebî bi tîpên latînî bona rastiya bilêvkirinê) wan bi ber hevdin, bê guman minhoyên transkrîpsiyonî hêsantir têne xwandin. Weha me têkstine (“Kurdische Sammlungen” yên E. Prym u A. Socin, 1887, S. Petersburg) dema xwandevanê dokrotra bûn (1979-1982) li Mosko xwandin u li

Elmaniya jî dixwînin. Bona zanîna rastlêvkirina bêjeyine "Dastana Cembelî Mîrê Hekariya" ("Kurdische Text, Le Cop, Berlin 1903") em neçar bûn di 17.06.2006-an de çend rêzan bi transkrîsiyona latînî bixwînin, herweha her nivîsek bi elfabeya erebî hatibe nivisîn u nîşanên dengdariyê liser ne hatibin danîn, bi dijwarî ew elfabeya,- berî hemiyan ji ereban re-tê xwandin.

Berî rûxandina Yekitiya Sovyêtê zimanê kurdî bi sê elfabeyan dihate nivisîn; hebûna sê elfabeyan, hebûna sê sînoran bû. Di roja îro de em kurd xwedî du sînorên çandî ne, xwedî du-sê wêjeyên (edebiyat; lîtêretûr) netewî ne. ev bobelateke (tragêdiya) çanda me ye!!

Elfabeya latînî kurdî ji sala 1919-an de li Bakurê Kurdistanê cihê xwe di nivîsa kurdî ya Celadet Bedirxand (1894-1951) de dibîne, ew ji aliyê wî de hate lêkanîn, jiber hêsaniya bilêvkirin u nivîsa zimanî. Zimanê kurdî zimanekî îndo-ewropî ye, ji grûpa rojavaya bakurî ya zimanên îranî ya. Ew dûr e ji malbatên zimanên erebî w turkî, nîzîke bi hoyên hevsêyî yê (dirawsêtîyê).

Elfabeya Celadet Bedirxan 31 tîpî ye; hema hemî dengên zimanê kurdî pê derdikevin. Lê eger kesin bibêjin bi wê mera nikane tîpine erebî binvîse w pêwîst nake bikaranîna wê; ew çewtiyê dikin, çinkê bi varyanta 36 tîpanî ya şakara C. Bedirxan hemî dengên erebî tê de cihên xwe digirtin, **lê wî dît, ku**

**ew dengina ne kurdî ne, mera elfabeyê bo kurdî datîne, ne jibo erebî,** tîpên berhema xwe kêmkirin. Elfabeya Ereb Şemo w Morgolov di sala 1982-an de li Êrêvanê hate danîn, di wê de dengên tîpên erebî jî hebûn.

Elfabêyên latînî yên zanayên kurd **bi koşiş u rezamendiya wan hatine amadekirinê,** (ew ne elfabeyine kotekî ne) mera kane pê hemî dengên erebî jî binivîse, lê berêz N. Ebdulla xwe newestandî, nexwestiye li kutêba C. Bedirxan u Roger Lescot, Grammaire kurde (Dialecte kurmandji) Paris, 1970 u li "Xuêndewarî baw", Bexda, 1933 ya Tewfîq Wehbî w ne li "Nûsînî kurdî be latînî", Bexda, 1975 ya Cemal Nebez u ne li "Elfûbêy Kurdî", Hewlêr, 1960 ya Gîw Mokriyanî w "Rênûsî kurdî le sedeyekda, Bexda, 1976ya Hamêd Ferec" temaşbike, ku di wan de care ji nivîsa tîpên erebî re hatiye dîtin, her tenê êrişa xwe biriye ser zanayê mezin yê gelê kurd Celadet Bedirxan.

Di wan elfebêyan de hemî nimûneyên wî di nivîsara xwe de anî bûn, pê têne nivisîn; lê nûser xwe weha numa bike w ji hemî şakaren Nalî (1800-1856) di helbestvaniya kurdî de her peyva "Hebîbekey" Nalî helbijêre **"Ke hemû cwanî w îstatîkakey le (ح)-ekeda kobûtewe".** (r.9) Çi pêwendiya peyva erebî (حبيبي) bi zimanê kurdî ve heye? Eger mebesta wî ev bêyta Nalî be, em tu êstêtîkê tê de nabînin.

"*Pêm dellên* **mehbûbe** *xêl û qîçe meylî şerr deka*
*Xêl û qîçe ya terazûy nazî nextê ser deka*

Her kurdek vê bêytê bixwîne, wê tu ciwaniyê di wê bêjeyê de nebîne.- eger ne çend mela w sofî bin-lê huner w helbesvaiya resen jibo hemdemê ye. Ewan malkên nayab di dîwana helbestvanê mezin de hene, ku di dema wî de w heta derketina E. Goran mera pir helbestvanan di bin sêbera Nalî de dibîne, ma divê mera navê xwe weha lekedar bike?!

### *Elfabeya Celadet Bedirxan original e, yan kopî ye?*

Lêkolîn liser elfabeya latînî kurdî bû erka me, dema me liser kovara Hawarê xebata xweye zanistî li Mosko dikir. Di sala 1981-a de me lêgerîna xwe bi sernivîsa "Celadet Bedirxan wek hîmdarê elfabeya latînî kurdî" bi zimanê rûsî nivîsî. **Rayeke leng (çewt) di kurdnasiyê de** berî vekolîna me liser vê mijadê belavbûbû; hemî kurdnas u pisporan ev lengiya dubaredikirin u mixabin ta niha jî dikin, ku Celadet Bedirxan elfabeya latînî kurdî ji ya tirkî biriye. *(Pêwîst nake em dîsan wan belgeh w rayan li vir rêzbikin, ewên dixwazin wê bixwînin, ew di paşbenda vê nivîsarê de ye: Ew bi tîpên latînî di berhema me de "Raperîna çanda kurdî di kovara Hawarê de" belavbûye w bi elfabeya erebî jî bi bernavê Dr. Husên Rehber di kovara Roşnibîrî Nuê de, hej. 105, 1985, r.96-100 çapbûye, bi zimanê*

*elmanî jî di* *www.Google* *de, di bin navê "hussein habasch" tê dîtin).*

Ji bo ew kesên dibêjin elfabeya C. Bedirxan kopiya tirkî ye, em wan herdu elfabeyan didine berhev, cudahî û"wekheviyan" pêşberdikin:

Ev tîpina **di tirkî de: ð, I, ö, ü** hene w di kurdî de tine ne:

Tîpên **kurdî: ê, î, û, q, x** (ew di tirkî de tine ne)

**Tîpên hevbeş: ç, ş-ne**

Herweha C. Bedirxan jî nivisiye: **"Wekê tirk elfabeya xwe belav kirin me dît ku di dengên hin herfan de elfabeyên me ne mîna hev in."**

(Hawar, hej. 13, 14 Çileyê – Berê, 1932, r.2) C. Bedirxan elfabeya xwe nîzîkî ya tirkî kir, berî derxistina Hawarê jiber vê sedemê (hoy; ûşt): **"Herwekî me berê jî çend caran goti bû, ji bona hêsanî kirina xwendina nivîsarên me, ji kurmancên Tirkiyê re, me dengên hin herfan bi hev guhartin u herçend hebû me ew çend elfabeya xist nîzîngî elfabeya tirkan"**. (Hawar. 13….)

**Kî ji virûhada bibêje elfabeya latînî kurdî ya Celadet Bedirxan 13-e salan liser kar kirî kopiyeke tirkanî ye, ew nerastiyê belavdike; sextekariyê dike w destketina mezinê kurdan rûreş dike.**

Ew kesên bi dijmanitî liser elfabeya latînî kurdî celadetî dinivîsin rayên xwe liser elfabeya T. Wehbî,

ya pê ev ferhenga nayab nivisiye “A kurdiş-Engliş Dictionary, by Tawfiq Wahby and C. J: Edmonds, Oxford University Press 1966” w elfabeyên C. Nebez u G. Mokriyanî; ne dane; ma hoy çî ye? Em jî li vir dipirsin: Ma ew ne elfabeyên latînî kurdî ne? Ma ew original in yan kopi ne? Bersiva me liser wana aşkere ye, em bi serbilindî li wan karan temaşdikin u herwha li karên her kurdekî dilsoz, ku di dijwartirîn mercan de dixebite bo geşkirin u pêşdabirina çanda kurdî.

***Elfabeya laînî tirkî.***

Me çar bend bi zimanên elmanî w înglîzî liser vê mijadê temaşekirin: Di wan de weha hatiye, ku sala 1850-î wêjevanekî ezerî bi nave Fätä Axundov, yê li Gorgiya (Coricya) hatibû dine ji miletên tirk w teter re elfabeyeke latînî amadekiribû. Sala 1863-an diçe Istanbûlê w pişkdariyê di kongira “Civata Toraniyan” de dike. Ew pirojeya elfabeya xwe li wir raberî beşdaran dike, lê alîgiran jê re nabîne, bi xemsarî vedigere welatê xwe.

Serkirdayetiya Sovyêtê bona bidûrxistna miletên misilman li Asiya Navîn ji bandûra misilmantiyê biryara bikaranîna elfabeya latînî li şûna ya erebî da w elfabeyeke latînî li Baku di sala 1922-an de tê amadekirin u Ezirbêcan wê sala 1923-an dipejirîne (Azerbaijan, Spring 2000, p.3) w di sala xwendinî 1924/25-an de tê bikaranîn. Herweha jî li Baku di

26-ê şibat u ta 5-ê adara 1926-an kongira tirknasan hat girêdan. Tirknasên hemî miletên tirkîaxêv tê de beşdarbûn. Mistefa Kema jî ji Tirkiyê hatibû. Li wir bi piraniya dengan raya bikaranîna elfabeya latînî bi serdikeve.

Biryareke weha jî dan, ku ew elfabeya li Tirkiyê jî bê xebitanidin. M. Kemal vedigire w propegenda ji wê pirojeyê re dike (bin.: Kovara L'lllustration, 3. Oktober, 1928, Internet. Die turkische Sprache….) û sala 1928-an elfabeya latînî ewa ji Baku hatibû nave "Elfabeya latînî tirkî nû" wergirt. Berî tirkan ew li rêpûblîkên Ezirbêcan u li Teteristanê (1927) kete xebatê w ew tîpên hevbeş di navbera ya kurdî w tirkî de "ç" û "ş" di wê elfabeyê de ne, yanê C. Bedirxan tu tîp ji tirkî ne birine, ew ne destketineke tirkî ye, lê belê sovyêtî ye. (bin.: Omniglot. Tatar, Internet, bi înglîzî). Weha dixuye ku tiştekî karbidestên Tirkiyê di wê elfabeyê de tine ye, jibilî bikaranîna wê.

***Elfabeya latînî kurdî kevn e, yan ya Mistefa Kemal ji Baku anî bû?***

Pirsa elfabeya latînî bala C. Bedirxan rakşandibû, dema ew hîn sjagirtê dibistanê bû li Istanbûlê (bin.: Hawar, hej. 13, r.1) û di sala 1919-an de dest bi karê elfabeyê kir. Li Münchenê (Elmaniya) sala 1922-a hejmara tîpên elfabêyê 36 bûn, li wî bajarê elmanî liser kardike, ew du tîpên ji elfabeyên yonaî w rûsî biribûn, jê rakirnin. Dema ew vedigere Istanbûlê xwest kitêboka elfabê w ferhengeke biçûk çap bike;

paşê li Şamê tîne bira xwe **“Lê mixabin ne ew elfabê w ne jî ew ferheng îro ne di destê min de ne. Di sala 1925 a de digel hin nivîsarên min ên din gehîştine heta pêşberê mehkema Xarpûtê”.** (Hawar, hej.13, r.2) Jibona elfabê bibe hîmê nivîsê ji her zaravekî kurdî re, ew sala 1930-î Tewfîq Wehbî li Şamê dibîne w elfabeyên xwe didine berhev ta jê elfabeyeke yekbuyî amadebikin, lê T. Wehbî digot ya min hin ne temam e. C. Bedirxan derxistina Hawarê bêtirî pênc mihan bi derengî xist, jibo çavrêkirina hatina elfabeya T. Wehbî, dema bersiv ne hat, êdî bêhêvî ma w kovara xwe belavkir. Ev e bikurtî dîroka xebatê liser elfabeyê.

Pirsên serekîn li vir: Jibo çî kurd li destketinên xwe xwedî dernakevin? Jibo çî piraniya kurdan baweriyê bi xwe nakin u kesayetiya xwe kêm u nexweş dibînin?

Nasûtek bi sedsalan rajeya gelên hevsê kiribe w ew gihîştandibin tepelên bilind, nikane têbigîhne, ku ew kane rajeya kurdan jî bike. **Ev e nasûta me ya bixwenebawer!**

***Liser kultura gelên bi alfabeya erebînivîs.***

Bi bêjeyine tûj (dizêwbûn; zeq) mamoste numakiribû, ku nivisîn bi elfabeya latînî wê bi hoy be, ku kurd “rojavaperist” bin u nîzîk bibin li ewropiyên şepqeliser u wê dûrkevin ji kulturên gelên

herêmê yên bi elfabeya erebînivîs. Em ne li wê bawerê ne, ku ev raya rast be, jiberku ew gelina bi xwe ji kultura eworpiyan nîzîktir in bêtir ji yên hev u jiber nebûna navendîbûna (sentralîzma) kultura kurdî, ew neçar dimîne di bin bandûra wan de bimîne, ew jî fênomêneke (diyardeyeke) neerînî ye. Kurdistan jî di bin kartêkiriya çanda ereb, faris u tirkan de ye. Karbidestên wan welatan ewên welatê me parvekirine rê ne dane w nadin, ku em wek kurd bijîn, ew kuştin u nehêştinê bi ser me de hidiweşînin; wê çawa bihêlin em çanda xwe pêş ve bibin?. Di kulturên serdest u bindest de tenê sûd ji ya serdest re ye. Kultur çiqas tevhev bibin, ewna havil e ji hemî gelan re, lê divê bingehên wê tevheviyê rewa w dadmend bin.

***Bêjeya Dawiyê***

Elfabê eger erebî ya latînî be amêrek e, bo aramncekê, ku çand u heyîna kurdî pê bête nivisîn, niha ew herdu li meydanê ne. Nabe kes ji kurdan elfabeyekê, zaravekî, bi ser tevahiya gelê kurd de bi kotekî bisepîne; ew metirsiyeke pir mezin e w bi carekê ne di rajeya yekîtiya gelê kurd de ye. Yekîtiya kurdan-çawa Celadet Bedirxan nivisiye-ji yektiya tîp u zimên destpêdike. Bila kes tê negîhne, ku zimanê kurdî du ziman in, na ew zimanek e, lê mercên siyasî w erdnigarî hêştine, ku ew hinekê jihev dûrkevin. Kêşeya (arîşe) elfabeya kurdî

kêşeyeke siyasî-candî ye, divê serkirdeyên kurdan bi zanebûn li gel pisporan bixebitin, ew prosêsa jî wê demeke dirêj berdewam bike. Ta ew yeka bi encamine serketî gîhne, divê bi herdu elfabeyan bê nivisîn w xwandin li hemî dezgehên kurd u Kurdistanê. Eger rojekê ji rojan pêwîstiya yekitiya wan derkeve meydanê, gelê kurd wê raya xweye rast di wê babetê de bibêje.

Bonn, 29.01.2007

# ملخص البحث

## عن الف باء اللغة الكردية بالحروف اللاتينية

د. حسين حبش

يسلط البحث الضوء على بدايات كتابة اللغة الكردية بالحروف اللاتينية من قبل المرحوم جلادت بدرخان وهو الرائد في هذا المجال.

يسرد الباحث جهود العديد من الذين حاولوا وضع الف باء اللغة الكردية بالحروف اللاتينية.. ويقارن بين اللاتينية التركية والكردية لاسيما فيما يخص الحروف الصائتة.

ويستنتج الباحث بأن الف باء الكردية اللاتينية ليست نسخة مأخودة من التركية.. ويستند في استنتاجه هذا على الاختلافات الموجودة بين اللغتين في نظامهما الصوتي.

## Abstract

### About Kurdish Alphabet in Roman Scripts

**Dr. Husain Habash**

This work is an attempt to shed a light on writing Kurdish in Roman scripts by Jaladat Badirxan who is a pioneer in this field.

The researcher acknowledges those who attemped to establish a Kurdish writing system based on Roman scripts. He compares between Turkish and Kurdish and concludes that Kurdish writing system based on Roman scripts is not taken from Turkish.

# کتێبە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان

١) فەرهـەنگی زاراوە ( عـەرەبی– کـوردی)، بـەدران ئەحمـەد حـەبیب، هـەولێر، چـاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٢، ( ١٤٢ لاپەڕە).

٢) کـوردی تورکمانـستان– مێـژوو– ئـەتنۆگرافیا– ئـەدەب، د. مـارف خەزنـەدار، هـەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٣، (٢٥٨ لاپەڕە).

٣) زاراوەی یاسایی، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتـی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٤٠ لاپەڕە).

٤) زاراوەی کارگێڕی، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٤٧ لاپەڕە).

٥) مـن ینـابیع الـشعر الکلاسـیکی الکـردی،ج١، رشـید فنـدی، هـەولێر، چـاپخانەی وەزارەتـی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٢٤٠ لاپەڕە).

٦) ڕێنووسی یـەکگرتووی کـوردی، بـەدران ئەحمـەد حـەبیب، هـەولێر، چـاپخانەی وەزارەتـی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٥٦ لاپەڕە).

٧) ڕێزمانی کەسی سێیەمی تاک، د.شیرکۆ بابان، هـەولێر، چـاپخانەی وەزارەتـی ڕۆشـنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (١٥٩ لاپەڕە).

٨) چوارینێن خەیام، د. کامیران عالی بەدرخان، وەرگێڕانی لە لاتینییەوە د. عەبدوللا یاسین ئامێدی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٩٤ لاپەڕە).

٩) شێوەی سلێمانی زمانی کوردی، د.زەرێ یوسوپۆڤا، و. لە ڕوسییەوە د. کوردستان موکریانی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢١٦ لاپەڕە).

١٠) **العروض في الشعر الكردي، احمد هردي**، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٢١٨ لاپەڕە).

١١) ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی و مێژووی چاپخانە ١٤٥٠–١٥٠٠، د. مەغدید سەپان، هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٧٨ لاپەڕە).

١٢) زاراوەی ڕاگەیاندن، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان ، هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٠٨ لاپەڕە).

١٣) فەرهەنگی زاراوەگەلی ڕاگەیاندن (ئینگلیزی– کوردی– عەرەبی)، بەدران ئەحمەد حەبیب، هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٦٥ لاپەڕە).

١٤) ئەدەبی منداڵانی کورد – لێکۆڵینەوە–مێژووی سەرهەڵدان، حەمە کەریم هەورامی، هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٤٠٦ لاپەڕە).

١٥) گیرەکێن زمانێ کوردی، د. فازل عمر، هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٣٤ لاپەڕە).

١٦) ل دۆر ئەدەبیّ کرمانجی ل سەد سالاً نوزدیّ و بیستیّ زایینی، تەحسین ئیـبراهیم دۆسـکی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٧٦ لاپەڕە).

١٧) دەنگسازی و بڕگەسازی لە زمانی کوردی دا، د. شێرکۆ بابان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٠٦ لاپەڕە).

١٨) هۆنراوەی بەرگری لەبەرهەمی چەند شاعیرێکی کرمانجی سەروودا ١٩٣٩-١٩٧٠، د. عبدالله یاسین عەلی ئامێدی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٣٢٠ لاپەڕە).

١٩) یوسف و زولەیخا، حەکیم مەلا ساڵح، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٤٠٧ لاپەڕە).

٢٠) زمانی کوردان- چەند لێکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆجی زمان، پ. د فریدریش موولێر ئەوانی تر، و. لـە ئەڵمانییـەوە د. حمیـد عزیـز ، هـەولێر، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، سـاڵی ٢٠٠٥،(١٩٢ لاپەڕە).

٢١) ڕێبەری بیبلۆگرافیە کوردییـەکان ١٩٣٧-٢٠٠٥، شـوان سـلێمان یابـە، هـەولێر، چـاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٤٠٠ لاپەڕە).

٢٢) فەرهـەنگی گـەورەی مـن . د. کوردسـتان موکریـانی ، چـاپی یەکـەم، هـەولێر، چـاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦ ،(٨٠ لاپەڕە).

٢٣) دیوانی عەزیز- محەمەد عەلی قەرەداغی – هەولێر، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە ، سـاڵی ٢٠٠ ، (١٤٤ لاپەڕە).

٢٤) زاراوەگەلی کاروباری مین ـ جەمال جەلال حوسێن - دلێر سابیر ئیبراهیم — دەزگای گشتی هەرێم بۆ کاروباری مین، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦ ، (٨٠ لاپەڕە).

٢٥) زاراوەی راگەیاندن ـ کەمال غەمبار- هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، ساڵی ٢٠٠٦، (٩٦ لاپەڕە).

٢٦) زاراوەی ئەدەبی ـ ئامادەکردنی : لیژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان ، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، ساڵی ٢٠٠٦ ـ (٣٨٠ لاپەڕە).

٢٧) ئیندێکسی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ( ١٩٧٣-٢٠٠٢ )- شوان سلێمان یابە- هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، ساڵی ٢٠٠٦ ، (٢٤٠ لاپەڕە).

٢٨) **The Historical Roots of the National Name of the Kurds -**
د. جەمال رەشید ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، ساڵی ٢٠٠٦، ( ١٠٧ لاپەڕە)

٢٩) فەرهەنگی کۆمەڵناسی ـ عوبێد خدر ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس- هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ( ٨٣ لاپەڕە ) .

٣٠) بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتیمانی لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا (١٨٨٠ ـ ١٩٣٩ز) ـ د. سەعدی عوسمان هەروتی ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس- هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ( ١٥٥ لاپەڕە ) .

٣١) ( شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا- نووسینی : حەسەن عەلی خانی گەرووسی). وەرگێڕانی لە فارسییەوە : محەمەد حەمە باقی . چاپخانەی دەزگای ئاراس- هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ( ٢٠٤ لاپەڕە ) .

٣٢) ( شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی ئەرمەنیدا- نووسینی : ئەسکەندەر غۆریانس ). وەرگێڕانی لە فارسییەوە : محەمەد حەمە باقی . چاپخانەی دەزگای ئاراس- هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ( ١٢٨ لاپەڕە ).

٣٣) ( فەرهەنگی کوردی ـ فارسی ). وەرگێڕانی لە فارسییەوە : محەمەد حەمە باقی . چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١١٢ لاپەڕە ) .

٣٤) (شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی ئینگلیزی و ئەمریکی دا - نووسینی : وەدیع جوەیدە). وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە : محەمەد حەمە باقی . چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ( ١١٦ لاپەڕە ) .

٣٥) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا — نووسینی : عەلی خان گۆنەخان ئەفشار. وەرگێڕانی لە فارسییەوە : محەمەد حەمە باقی . چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٤٢٦ لاپەڕە ) .

٣٦) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا- نووسینی : عەلی ئەکبەر سەرهەنگ. وەرگێڕانی لە فارسییەوە : محەمەد حەمە باقی . چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧. (١٩٢ لاپەڕە).

٣٧) چەپکێك لە زاراوە گەلی کشتوکاڵ ـ ئامادەکردنی: حەمە ساڵح فەرهادی ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ( ١٤٤ لاپەڕە ) .

٣٨) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران دا. وەرگێڕانی لە فارسییەوە : محەمەد حەمە باقی . چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٢٧٠ لاپەڕە)

**٣٩)** فەرهەنگی دیوانی شاعیران ( **نالی ، سالم ، کوردی** ) ، نووسینی : د. **محەمەد** نووری عارف . **چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١٠٠٠ لاپەڕە).**

**٤٠) فەرهەنگی گەورەی تۆ ـ وەرگێڕانی : د.کوردستان موکریانی ، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٨٦ لاپەڕە).**

**٤١) ئەدەبی منداڵانی کورد دوای ڕاپەڕین. نووسینی : حەمە کەریم هەورامی ، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٣٦٨ لاپەڕە).**